# ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل




## فەلسەفەو مۆدێرنیزم

چاپی دووەم

٢٠٠٤





لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما

زنجیرەی( ٣٥ )

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی(١٥) کتێب

ئیسماعیل کوردە_ ڕێبین ڕەسوڵ _ جەمال پیرە

ناوی کتێب: هیگڵ-فەلسەفەو مۆدێرنیزم

بابەت: لێکۆڵینەوەی فەلسەفی

نووسینی: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

تایپ: یسرا ڕەسوڵ ئیسماعیل

دیزاین و بەرگ: ئیسماعیل کوردە

چاپخانەی ڕەنج

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ (٢٥٠٠)دینارە





# پێشەکی

## لێکۆڵینەوە لەهیگڵ کۆتایی نایێت!!!

هیگڵ فەلسەفەکارێکە مرۆڤ دووچاری سەرسوڕمان دەکات، ناوێکە نزیکەی دووسەدەیە دیالۆگو وتوێژی لەبارەیەوە دەکرێت. هەندێك کەس پێیان وایە خودی فەلسەفە لەنێو کەسایەتی هیگڵ-دا بەرجەستەکراوەو ئەو خۆی بۆتە فەلسەفەیەکی بەرجەستەکراو، لەبەرئەوەی نوێکەرەوەی فەلسەفەی ئایدیالیزمی دیالیکتیکییە، کەچی هێندێکی تر پێیان وابوو ئەو بکوژی ڕاستەقینەی فەلسەفەیەو لەسەردەستی ئەو فەلسەفە تیرۆرکرا! هەندێك گوتیان فەلسەفەکاری فەلسەفەکارییە، کەچی هێندێکی تر پێیان وابوو نەفەلسەفەکارەو نەهزرڤان، تەنیاو تەنیا زانایەکی لاهوتییەو وانەبێژی ئایینی فێری خەڵك دەکات.

کیرکیگۆر ئازایەتییەکی زۆری نوواندو گوتی هیگڵ ئەو فەلسەفەکارەیە کە ئازایەتی ئەوەی کرد فەلسەفە بخاتە پلەیەك لەسەرووی ئایینەوە بێت، لەولاشەوە بەشێکی تر پێیان وابوو هەموو تیۆرو فەلسەفەکەی نمایشکردنی فەلسەفەی مەسیحی بووە، بەڵام بەشێوەیەکی ترەوە. هەندێك لەوباوەڕەدابوون خاوەنی مەزنترین‌و کاریگەرترین فەلسەفەی پۆزەتیڤە، کەچی شلینگ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هیگڵ نەیتوانیوە لەفەلسەفەیەکی نێگەتیڤ زیاتر شتێك پێشکەشی خەڵك بکات. هێندێك گەیشتنە ئەو باوەڕەی فەلسەفەکەی گەورەترین‌و مەزنترین کۆمیدیای خواوەندییانەی فەلسەفی بووە، لەولاشەوە کەسانێك هەبوون وا دەیانڕوانییە کارەکانی گوایە فەلسەفەکەی هیگڵ دێوەزمەیەك بوو لەدێوەزمەکانی یەکێك لەپیاوانی لۆژیك. بەشێك پێیان وابوو خاوەنی گەورەترین داستانی هزرییە، کەسانێکیش هەبوون بەگەورەترین هەڵەی





نێو مێژووی فەلسەفەیان داناوە. هێندێك ناویان ناوە مەزنترین فەلسەفەکاری نێو مێژووی مرۆڤایەتی، کەچی شۆپنهاوەر دەڵێت لەکەرێکی تۆپیو زیاتر نەبووە! ئەلبێرکامۆ پیی وایە هیگڵ ئەوکەسەیە کە ناماقوڵی عاقڵ کرد، بەڵام هێندێکی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو داهێنەری نەزعەی ناعەقڵانییەتی تازەیە! بەشێك لەلێکۆڵەرەوان پێیان وایە گەورەترین فەلسەفەکاری ئایدیالییە کە توانیبێتی بەزمانی ڕەها بدوێت، کەچی بەشێکی تر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەڕەها لەسەر دەستی ئەو لەناوچوو! مارکس گەیشتە ئەو باوەڕەی عەقڵێکی گەورەیە شتەکانی سەراوژێرکردو خاوەنی میتۆدێکی شۆڕشگێڕییە، کەچی هێندێکی تر پێیان وایە یەکێك بووە لەبانگەشەکارە گەورەکانی نەزعەی کۆنسێرڤاتیزم!

بەم شێوەیە دیارە مامەڵە لەگەڵ دەقی فەلسەفییانەی هیگڵ مامەڵەیەکی سادەوساکار نییە! بەپێچەوانەوە کارێکی سەختو دژوارو زەحمەتە. هیگل خۆی هەرگیز ڕێگا بەوە نادات فەلسەفەکەی تەسلیم بەهەموو کەسێك بکات، ئەوە فەلسەفەیەکە بۆ ئەوەی دەرگاکانی والآبکەیتو بچیتە ناوی، پێویستیت بەو پێداویستی‌و کەل‌و پەلانەیە کەڕێگاکەت ڕۆشن دەکەنەوە، ڕەنگە چوونە نێو فەلسەفەکەی ئەوەندە ئەستەم نەبێت، بەو ڕادەیەی هاتنە دەرەوە لێی سەختە! بۆیە ئەوەی مامەڵە لەگەڵ دەقی هیگڵ-ی بکات دەبێت خاوەنی کەرەستەیەکی مەعریفی‌و مێژوویی وابێت بتوانێت لەچەند ڕەهەندێکەوە دەقەکان بخوێنێتەوەو لەنێو سیاقی مێژوویی خۆیدا نمایشیان بکات.

هیگڵ لەچرکەساتێکی دیاریکراوی مێژووییدا دەگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەو هەموو بۆچوون‌و تیۆرە باشەکانی فەلسەفەکارانی بەرلەخۆی لەنێو تێڕوانین‌و مەزهەبی دیالیکتیکی خۆیدا تواندۆتەوە، بۆیە ئەگەرچی بەشێکی جەوهەری‌و گرنگی فەلسەفەکەی دادەڕمێت-مەبەستمان فەلسەفەی سروشتە-کەچی هیگڵ کۆن نابێت‌و پیر نابێت! ئێستاش دوای زیاتر لە(١٧٣ )ساڵ پاش مردنی، کەچی لێکۆڵینەوەو شیکارو ڕاڤەکردنی بۆچوونەکانی





بەردەوامە، بەتایبەتیش کاتێك دەزانین کاریگەری بۆچوونە دیالیکتیکییەکەی چەندە گەورەبووە بەسەر فەلسەفەی ماکسییەوە.

بەداخەوە هەندێك کەسو نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی پێیان وایە لێکۆڵینەوەو نووسینو گەڕانەوە بۆ سەرلەنوێ هەڵکۆڵینی فەلسەفەی هیگڵ، مانای گەڕانەوەیە بۆ میتافیزیکا! لەڕاستیشدا من لەم ڕوانگەیەوە ناڕوانمە لێکۆڵینەوەی فەلسەفی، هەرگیز حیسابی ئەوەش ناکەم میتافیزیکا چەندە لەنووسینو لێکۆڵینەوەکان سوودمەندە، چونکە ئەگەر گەڕانەوە بۆ هیگڵ بەڵگە بێت لەسەر سەرکەوتنو باڵادەستیو سەرلەنوێ گەڕانەوەی میتافیزیکا، ئەوە دیارە دەبێت مێژووی فەلسەفە، هەموو چرکەساتەکانی ئەم مێژووە، چرکەساتی سەرکەوتنو باڵادەستی میتافیزیکا بێت، بۆیە بەرزکردنەوەی مارکسیزم لەبەرانبەر هیگڵیزم بەمانایەك لەماناکان دەربڕی ئەم بۆچوونە بووە، مامەڵەی منیش لەگەڵ هیگڵو هەر هزرڤانو فەلسەفەکارێکی تر بەدەرە لەم بۆچوونە ئایدیۆلۆژییە تەسك بینە.

یەکێك لەکێشە هەرەگەورەکانی خوێنەری هیگڵ، زمانە فەلسەفییەکەیەتی، زمانێکی قورسو پڕ لەتەمووموژیو ئاڵۆزی بەشێوەیەك زۆرجارمرۆڤ واهەست دەکات هیگڵ بەئەنقەست ئەم کارەی کردبێت! منیش هەوڵمداوە ئەم شێوە نووسینە قورسەی هیگڵ بەزمانێکی سادەو ساکارو ڕوونو ئاشکرا نمایش بکەمو بیخەمە بەردەست.

لەڕاستیدا زۆر دوودڵ بووم لەچاپکردنی ئەم کتێبە لەبارەی هیگڵ، چەند جارێکیش بەرلەوەی بڵاوببنەوە ویستوومە بیاندڕێنم، بەڵام بەردەوام ئامۆژگارییەکی خۆی پاڵی پێوەدەنام دەستیان پێوەبگرمو ئازایەتی ئەوەش بکەم بڵاویان بکەمەوە، ئامۆژگارییەك تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بچوکترین کار مادام تەواوکراوە، زۆر بەهادارترە لەوبیرۆکەو پڕۆژەیەی کە هەروەکو پڕۆژەیەك ماوەتەوەو کاری تێدا نەکراوە.

من کارم لەم پڕۆژەیە کرد، دڵنیاشم لەوەی کونو کەلەبەری زۆری تێدایە! بەڵام پێم وایە باشترە لەوەی هەروەکو پڕۆژەیەك لەنێو مێشكو خەیاڵمدا





بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی هیگڵ خۆی ئامۆژگاری ئەوەمان دەکات کە کارێکی زۆر مەترسیدارە مرۆڤ هەوڵبدات بەتەواوی خۆی لەهەڵە بەدوور بگرێت، ئەوەی پێی وایە نابێت هەڵە بکات با کارنەکات! هیگڵ کاتێك کاری لەسەر پرۆژە فەلسەفییەکانی خۆی دەکرد هەموو هیواو ئاواتی ئەوەبووە وا لەفەلسەفە بکات بەزمانی ئەڵمانی بدوێت، لەم ڕوانگەیەوە ئەم هەوڵو کۆششەی ئێمەش تەنیا لەپێناوی ئەوەدایە هیگڵ ناچاربکەین بەزمانی کوردی قسە بکات!

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەکاتێکدا نمایشکردنو خستنەڕووی فەلسەفەی هیگڵ-ە، لەهەمان کاتیشدا قسەلەسەرکردنو ڕەخنەگرتنە، یا ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنە نادیارو شاراوانەیە کە هیگڵ زۆر بەپەلەو تێپەڕانە بەسەریاندا ڕەتبووە. بۆیە ئەم نووسینانە شیکارکردنن، شیکارکردنیش ڕاڤەکردن لەخۆیەوە دەگرێت، ڕاڤەکردنیش بەشێکە لەپرۆسەی ڕەخنەیی. لەکۆتایی ئەم پێشەکییەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە بەشی دووەمو سێیەمی ئەم کتێبە پێشتر لەگۆڤاری (ڕامان)ی خۆشەویستدا بڵاو کراوەتەوە. لەکۆتایی ئەم پێشەکییەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە بەشی دووەمو سێیەمی ئەم کتێبە پێشتر لەگۆڤاری (ڕامان)ی ئازیزدا بڵاوکراوەتەوە.

## بەشی یەکەم

# هیگڵ...قۆناغەکانی ژیانو کتێبە مەزنەکانی

ناکرێت باس لەفەلسەفەی هیگڵ بکەین، بەبێ ئەوەی لەخودی کەسایەتیو قۆناغەکانی ژیانی نزیك نەکەوینەوە، چونکە ئەم فەلسەفەیە پەیوەستی کەسایەتی خودی خۆی بووە بەجۆرێك زەحمەتە لەیەکتری جیابکرێنەوە، بۆیە پێم وایە هەرچەندەی سەرەدەری لەم فەلسەفەیە دەربکەین، ئەوەندە زیاتر پێویستیمان بەوە هەیە قۆناغەکانی ژیانی هیگڵ بناسینو لەنزیکەوە لەکەسایەتی هیگڵ تێبگەین، لەبەرئەوەی ناشێت هزر لەخودی کەسایەتی مرۆڤی هزرڤان دابڕێنین. دیارە فەلسەفەی هیگڵ لەگەڵ پێشفەچوونی ژیانی کەسایەتی خۆیدا بەرەو پێشفەچووە، بۆیە ئێمە لێرەدا لەبەردەم زیاد لەهیگڵێکداین، هیگڵی لاوو هیگڵی لاهوتیزانو هیگڵی مامۆستاو هیگڵی فەلسەفەکار، چونکە نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە هیگڵی لاو ڕۆڵێکی هەرە مەزنی هەیە لەدارشتنو پێکهاتنی هیگڵی مامۆستاو هزرڤاندا. جان هیپۆلێت لەبارەی هیگڵەوە دەنووسێت:" هیگڵ دوا میتافیزیکسنی مەزنە، چونکە ئەو بۆ خۆی زۆر بەڕوونی ئەوە دەزانێت کە ئەم هزرە فەلسەفییە لەگەڵ ئەو کۆتایی پێهاتووە، هەروەها ئەوەش دەزانێت کە هزری ئەو جێگای بایەخو گرنگی پێدانی ئێمەیە. ئێمە لەئاست هیگڵدا وەکو سەدە ناوەڕاستەکانین لەئاست ئەرستۆدا، چونکە ئەو تارماییە مەزنەکەی خۆی دەخاتە سەر سەرجەم ئەو وتارە فەلسەفییانەی لەبەرژەوەندی یا لەدژی ئەو نووسراون، ئەو تا





دوێنێش بەسەرچاوەی سروشی هزری مێژوویی دادەنرێت، مێژووی فەلسەفە، کە شوێنی فەلسەفە دەگرێتەوە"(١). کۆی گشتی فەلسەفەی هیگڵی ئەنجامی ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەن کە هیگڵ تێیدا ژیاوە، ئەو چرکەساتانەی کە هێدی هێدی بڕوا بوون بەتوانا عەقڵییەکانی مرۆڤ سەری هەڵدەدا، بۆیە هیگڵ لەژێر کاریگەری کانت‌دا کار دەکات، چونکە کانت ئەو کەسە بوو کە سەردەمی عەقڵی ڕاگەیاندو چەند کتێبێکی لەبارەی عەقڵو ڕەخنەگرتن لەعەقڵو بیرکردنەوەی سەردەمەکەی خۆی بلاوکردەوە، بەتایبەتیش ئەو وتارەی لەبارەی سەردەمی ڕۆشنگەری بوو کە لەژێر ناوی (سەردەمی ڕۆشنگەری چییە؟)بوو تێیدا بنەماکانی بیرکردنەوەی عەقلانی ڕوون دەکاتەوەو جەخت دەکاتە سەر عەقڵ.

جۆرج فیلیهلم فردریش هیگڵ لەڕێکەوتی(٢٧)ی ئەگستۆسی ساڵی(١٧٧٠) لەشاری شتوتگارتی ئەلمانی لەخێزانێکی بۆرژوازی لەدایکبووە، باوکی ناوی جۆرج لۆدڤیگ هیگڵ بووەو دایکیشی ناوی ماریای مەجدەلی بووەو لەبنەماڵەیەك بوو کە بە بنەماڵەی فرۆم ناسراو بوو(٢). لەتەمەنی (١٠) ساڵیدا، واتا لەساڵی (١٧٨٠)دا هیگڵ دەچێتە پەیمانگای توبنگن بۆ ئەوەی لاهوت بخوێنێت، لەم ماوەیەشدا فەلسەفەی ڕۆشنگەری خاوەنی ناوو ناوداریەکی مەزن بووە. خوێندنی هیگڵ لەتوبنگن ماوەی پێنج ساڵی خایاند، ئەم پێنج ساڵەش قۆناغێکی پڕ هەستیارو گرنگ بووە لەمێژووی ئەلمانیاو ئەورووپاو جیهانیش بەگشتی، چونکە لەساڵی(١٧٨٩)دا شۆڕشیمەزنی گەلی فەرەنسا سەرکەوتنی بەدەستهێناو ڕووگەی مێژووی ئەورووپاو جیهانی گۆڕی، دواتریش ساڵی(ڤالمی)هات، واتا ساڵی(١٧٩٢)کە تێیدا فەرەنسا ئەوەی ڕاگەیاند کەشاعیرو فەلسەفەکاری ئەلمانی شیلەر دەکرێتە هاولاتی شەرەف لەکۆماری فەرەنسادا(٣). کاتێك هیگڵ لە پەیمانگای توبنگن سەرقاڵی خوێندنی لاهوتە، ماریای دایکی لەساڵی(١٧٨٣)دا کۆچی دوایی دەکات(٤). زۆر لەو مێژوو نووسانەی باس لەژیانی هیگڵ دەکەن، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو هەرلەمنداڵیەوە زۆر جدی بووەو لەگەڵ خۆیدا تووند





بووەو زۆریش خۆی ماندوو کردووە، تەنانەت هەندێك لەوانە پێیان وایە هیگڵ وەکو منداڵانی تر سەردەمی ژیانی منداڵی خۆی نەژیاوە، بەڵام وەکو ئەوەی دیارە زۆر جدی بووەو لەکاتی مامۆستایەتیشدا بەردەوام کاتەکانی خۆی بەشێوەیەکی وا ڕێکخستووە کە بتوانێت بەرپرسیارێتییەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێتو لەژیانی کۆمەڵایەتی خۆیشی دانەبڕێت. حەزی هیگڵ بۆ ڕێکوپێکیو گونجانو هەڵکردن، هەر زوو پاڵی پێوەناوە بەدوای ئاشتیو یەکێتیو تەکامولدا بگەڕێت، بۆیە هەستی بەوە کردووە کە جیهان بەرجەستەکردنی ژیانێکی بێ کۆتاییانەیە. هیگڵ زۆرجار حەزی بەوە کردووە کە هەر منداڵ بووایەو هەرگیز گەورە نەببوایە، چونکە پێیوابوو منداڵ لەپێوەندی سروشتی بەردەوامدایە لەگەڵ سروشتدا، منداڵی لای هیگڵ ئەو چرکەساتەیە کە مرۆڤ بەبێ نواندنو بەشێوەیەکی ڕەمەکیانە پێوەندیو تەماسی ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ سروشتدا. هیگڵ-ی لاو لەم کاتانەدا سەرقاڵی ڕەهایی بووەو بەردەوام هەوڵیداوە بەدوای حەقیقەتی هەمەکیانەدا بگەڕێت، بۆیە سەیر نییە کە دەزانین چەندە هەوڵیداوە لەکارکردنو بەدەستهێنانی یەك نەسەقی گونجاو لەمەعریفەدا لاسایی ئەرستۆ بکاتەوەو هەوڵبدات زۆرترین ڕێژەی مەعریفەی زانستەکان لەنێو عەقڵی خۆیدا کۆبکاتەوە. ئەوەش وای لێدەکات لەکاتی خوێندنی لاهوتدا تەنیا بەوانەی مامۆستاکانی خۆی ڕازی نەبێت، بەڵکو لەدەرەوەی پرۆگرامی خوێندندا سەرقاڵی خوێندنەوەی چەندین کتێبو بابەتی مەعریفی تر دەبێتو تێبینی خۆی لەسەریان دەنووسێتەوە، ئەم ڕۆحە ئینسکلۆپیدی خوازە هانی هیگڵ دەدات بێت نووسینی نووسەرو فەلسەفەکارە گریکیو ڕۆمانییەکان بخوێنێتەوە، بەوەش بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت ڕووەو لێکۆڵینەوەی مێژوویی کێش بوو. ئەو ڕۆحە بزۆزە بۆفێربوونو مەعریفە وای کرد تەنانەت کاتێك کەپیریش بوو، کاتێك مامۆستای فەلسەفە بوو لەزانکۆی بەرلین، واهەست بکات هێشتا قوتابییەو دەبێت بەردەوام بێت لەفێربوونو وەرگرتنی مەعریفەدا، لەمبارەیەوە دلتای دەڵێت:" ئەگەر





هیگڵ لەمنداڵیدا بێبەش بووبێت لەنیعمەتی منداڵی، ئەوە لەکاتی پیریدا لاوێك بوو چاوەکانی پڕبوون لەباقو بریقی منداڵێتی"(٥)، بۆیە هیگڵ لەساڵانی دوایی تەمەنیدا بەردەوام بوو لەگەشتو گەڕانو سەردانی مۆزەخانەو شوێنەوارە مێژووییەکانی دەکردو دەچووە نێو هۆڵەکانی شانۆو ئامادەی نمایشە مۆسیقیەکان دەبوو.

هیگڵ فەلسەفەکارێك نەبوو لەواقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی دابڕاو بێت، بەپێچەوانەوە پیاوێکی کۆمەڵایەتی بووەو بایەخی زۆری بەڕووداوەکانی دەوروبەری داوەو حەزی بەکاری هونەری بووە، بەڵام پیاوێکی سۆزدارو ڕۆمانسی نەبووە، بەڵکو بەر لەهەرشتێك پیاوێکی عەقڵی بووەو جەختی لەسەر ئەوەش کردۆتەوە کە دەبێت عەقڵ بڕیاردەری هەموو شتێك بێت، تەنانەت بەردەوام هەموو جۆرە هەستو نەستو ئەزموونەکانی خۆی گۆڕیوە بۆ ئیدراکی عەقڵیو وێنەی هزری.

لەماوەی خوێندنی لەپەیمانگای توبنگن-دا، هوڵدرلینو شلینگ-ی ناسی، ئەگەرچی هیگڵ لەڕووی تەمەنەوە نزیکەی پێنج ساڵ لەهەردووکیان گەورەتربوو، بەڵام هاوڕێیەتیان بەتین بوو. ئەم پەیمانگایە بەپێی سیستەمێکی ئایینی توندوو تۆڵ بەڕێوە دەبرا، لەوێشدا هیگڵ ناسیاوی لەگەڵ هەندێك لەمامۆستاکان پەیداکرد، بەتایبەتیش مامۆستای وای تێدابوو کە پێوەندی هاوڕێیانەی لەگەڵ جان جاك ڕۆسۆدا هەبووەو لەڕێگایەوە هیگڵ لەم تەمەنەدا شارەزای کارەکانی ڕۆسۆ بووەو کتێبەکانی خوێندۆتەوە. جگە لەڕۆسۆ، هیگڵ کەوتۆتە ژێر کاریگەری هەریەك لەفیختەو کانت-یشو بەسەرگەرمیەکی زۆرەوە کتێبەکانی ئەوانی خوێندۆتەوە. جگە لەوانەش، هیگڵ بایەخی بەنووسینەکانی مندلسۆن داوە کە لێکۆڵینەوەی زۆری لەبارەی ئایینی یەهودیدا ئەنجامداوە. لەم کاتانەدا هیگڵ بەقووڵی ڕۆچووەتە نێو لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی فەلسەفەی گریکیو بۆتە لایەنگری ئەو ڕەوتە تاکگەرایانەی بانگەشە بۆ بوونی یەك حەقیقەتی خوایانەی تۆتالیتاریو گشتگیر دەکەن.

حەزکردنی هیگڵ بە نوێبوونەوە بووە هۆی ئەوەی هەموو ئەو نەزعە عەقڵییە تەسكو كورتبینانە بەلاوە بنێت کە لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا باڵادەستبوون، بۆیە بەهاوکاری هۆڵدرلینو شلینگ کاری بۆ ئەوە دەکرد کە خۆی لەجێکەوتە هزریەکانی فەلسەفەی ئەوکاتە دەرباز بکات کە جێکەوتی بەسەر فەلسەفەی ئەڵمانیدا دیاربوو. لەبەرئەوەی شۆڕشی گەلی فەرەنسا کاریگەری زۆری کردبووە سەر هیگڵ، بۆیە لەیەکشەممەیەکی ساڵی(١٧٩١)دا بەهاوڕێیەتی شلینگ دەچێتە قەراغ شاری توبنگنو درەختێك دەچێنێتو ناوی دەنێت درەختی ئازادی-شۆڕشی گەلی فەرەنسا لە(١٤)ی تەموزی ساڵی(١٧٨٩) ڕوویدا کاتێك سیستەمی پاشایەتی لویسی شازدەیەم ڕووخێنراو سیستەمی کۆماری بەسەر کردایەتی ناپلیۆن دامەزرا، ئەم شۆڕشە دروشمی برایەتیو یەکسانیو ئازادی هەڵگرتبوو. لەڕاستیدا هیگڵ لەو باوەڕەدابووە کە شۆڕشی فەرەنسی ئەنجامی هەوڵو کۆششێکی زۆری فەرەنسییەکان بووە لەپێناو بونیادنانی سیستەمێکی سیاسیو کۆمەڵایەتی کەلەسەر عەقلانییەتو ئازادی بونیاد نرابێت(٦). لەڕوانینی هیگڵ-دا عەقڵ ئاڕاستەکاری شۆڕشی فەرەنسی نەبوو، بەڵکو ئەو چرکەساتەی کە مزگێنی بەخشی شۆڕشی فەرەنسی بوو، چرکە ساتێکە مزگێنی ئەوەش دەبەخشێت کە لەمە بەدواوە مرۆڤ پشت بەبیرکردنەوەو عەقڵ دەبەستێت، ئەو ڕووداوە مێژوویيەی کە ناوی شۆڕشی فەرەنسییە حەقیقەت دەخاتە ژێر پێوەرەکانی عەقڵو ئاستەکانی، ئەو ڕووداوە سەلمێنەری ئەوەی کە عەقڵ کۆنترۆڵی حەقیقەت دەکات، چونکە یەکەمین پرنسیبو بنەمای ئەو شۆڕشە ئەوەیە کە عەقڵ کۆنترۆڵی حەقیقەت دەکاتو ئاڕاستەکارییەتی، ئەم گوتەیەش ناوەڕۆکی هەرە جەوهەریيانەی فەلسەفەکەی هیگڵ-ە(٧). لەنێو ئەو نووسینانەی کەئەوکاتە هیگڵ نووسیویەتی، چەندین لێکۆڵینەوەو وتار بەدی دەکەین کە تایبەتە بەیۆنانیەکانو هزری گریکی، تێیاندا هیگڵ ئاماژە بەئایینی گریکەکان دەکاتو جەخت لەسەر خۆشەویستی ئەوان دەکاتەوە بۆ ژیان. هیگڵ پێی وابوو ئایینی یۆنانیەکان







ئایینی مرۆڤی ئازادبووە کە هەست بەهەڵەکردنی مەسیحی ناکەنو ملی خۆیان ناخەنە ژێر پێی خواوەندی باڵا، بەڵکو ئەوان دڵسۆزیان بۆ ئەو خواوەندانەیە کەشارەکانیان دەپارێزنو ئاگادری کۆمەڵگاکەیان دەبن. کەچی مەسیحییەت وانییە، مرۆڤی فێری ئەوەکرد کە هاوڵاتییەکی ئاسمانیەو نامۆیە بەم سەر زەویە، بۆیە مەسیحییەت دێت ئەو ڕۆحە هەڕەمەکیەی مرۆڤ دەکوژێت کەمرۆڤی گریکی خاوەنداریێتی دەکات. لەبری ئەوەش مەسیحییەت دێت حەزکردن بەئێشو ئازار لەناوەوەی مرۆڤدا جێگیر دەکات، جۆرێك لەڕەفتاری ماسۆشیانە. ئالێرەدا دێت جۆرێك لەدژکاری لەنێوان ڕۆحی مەسیحییەتو ڕۆحی گریکیدا دەدۆزێتەوە، ئایینی هەڵەکردنو گوناه و قوربانیو ئازارو تلانەوەی ڕۆحی، لەبەرانبەر ئایینی ئازادیو بەختەوەریو بڕوابوون بەژیان دادەنێت. هیگڵ پێی وایە مەسیحییەت مۆرکی مرۆڤایەتیانە لەژیان دادەماڵێتو سروشت وەکو کۆمەڵێك هێزی مادیيانە نمایش دەکات کە دەبێت مرۆڤی مەسیحی کار بۆ دەستەمۆکردنو کۆنترۆڵ کردنیان بکاتو مرۆڤی کردۆتە کۆیلەیەکی بێ دەسەڵات کەدەبێت لەبەردەم خواوەندا کڕنۆش بباتو چۆك دابداتو ئەوەش ڕابگەیەنێت کەهەموو کاروکردەوە چاكو باشەکان لەلایەن خواوەندەوەیە، لەهەمان کاتیشدا هەموو کارو کردەوە خراپو ناپەسندەکانیش لەلایەن مرۆڤەوەیە. لەم ڕوانگەیەوە بوو کەهیگڵ لەتەمەنی لاویدا هێرشی زۆری کردە سەر ئایینی مەسیحی بەوسیفەتەی کەئایینی ئازارو ئێشو تلانەوەی ویژدانە. دەبێت ئەوەش بزانین کە لەم ماوەیەی لاوێتیدا، هیگڵ بەتەنیا خەریکی مەسەلەی ئایینی نەبووە، بگرە مەسەلە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانیش سەرقاڵی کردووە، لەم کاتانەدا ئەڵمانیا لەژێر بارێکی سەختی کارگێڕیدابوو، گەندەڵی سیاسی باڵی بەسەر ڕەوشەکەدا کێشابوو، ناکۆکیو ململانێی ناوەخۆ دووبەرەکی نابۆوە، بۆیە ئاساییە کەسێکی وەکو هیگڵ سەرقاڵی بیرکردنەوە بێت لەدەربازکردنی وڵاتەکەی لەم تەنگژانە. بەم شێوەیە هیگڵ لەنێو دوو قەیراندابوو،

قەیرانێکی دەرەکی کە قەیرانی سیاسیو کۆمەڵایەتی وڵاتەکەیەتی، قەیرانێکی ناوخۆیی کە قەیرانی ئایینی خۆی بوو. لەڕاستیشدا هەردوو قەیران دوو ڕووی یەك كێشە بوون لەلای هیگڵ‌دا، بۆیە ئەو زیاتر سەرقاڵی دۆزینەوەی چارەسەریەك بوو کەیەك چارەسەری بێت بۆهەردوو قەیران.

لەبارەی قەیرانی ئایینیەوە، دەبینین هیگڵ بەتوندی ڕووبەڕووی ئەو نەزعە عەقڵییە چەقبەستووە دەبێتەوە کەلەم کاتانەدا لەئارادا بووە، بۆیە ڕەخنەی ئەوەی لەفەلسەفەکارانی ڕۆشنگەری دەگرت کە ئەوان توخمە تراژیدیەکانی نێو پێکهاتەی مرۆڤیان فەرامۆشکردووە. ڕەخنەی ئەوەی لەکانت دەگرت گوایە نەیتوانیوە بەڕاستی لەخۆشەویستی تێبگات وەکو ئەوەی ڕەفتارێکی پاكو بێگەردو ئەپستراکتە لەهەموو مەبەستێك. هیگڵ مەبەستی نەبووە لەم کاتانەدا هیچ دابڕانێك لەنێوان عەقڵو هەستناکیدا دروست بکات، بەڵکو پێی وابوو کەهەر ئایینێك یا ئەخلاقێك ناشێت بەتەنیا لەسەر عەقڵی پەتی بونیادنرا بێت، ئەگەر واش بێت، ئەوە غەدرێکی زۆر لەواقیعی مرۆڤایەتی دەکرێت. هەموو ئایینێك ئەگەر تەنیا کاری ئەوەبێت کۆمەڵێك عەقائیدی مەزهەبی بداتە پێڕەوکارانی، ئەوە بارێکی گران دەخاتە سەر یادەوەری مرۆڤ بەبێ ئەوەی بتوانێت ویستیان ببزوێنێتو بەرەو کارکردنو هەنگاونانی کردەیی پاڵیان پێوەبنێت. کەواتە لەبری ئەم ئایینە بابەتیەی کە هەڵقووڵاوی نەزعەی عەقڵیو لاهوتیو فەلسەفییە، دەبێت هانا وەبەر ئایینێکی تر بەرین کەلەسەر کارو گۆڕینی ویستو نوێکردنەوەی دڵ بونیادنرا بێت، نەوەکو تەنیا باوەڕبێت بەهەندێك حەقیقەتی تیۆری یا دەستگرتن بێت بەپێوەندییەکی ئەپستراکتانە لەگەڵ حەقیقەتی خوایی، یا بانگەشەکردنی هەندێك عەقیدەی پەتی عەقڵی بێت. لەم قۆناغەدا هیگڵ تەنیا ڕووبەڕووی نەزعەی عەقڵی توند ڕەوانە نەبۆوە لەتێڕامان لەئاییندا، بەڵکو بەسەر نەزعەی تاکگەرایی تووندڕەویشدا هەڵگەڕایەوە کە جەختی لەسەر ئەوە





دەکردەوە گوایە ئایین تەنیاو تەنیا پرسێکی کەسایەتیانەیە. پاساوی هیگڵ لەم لایەنەوە ئەوەبوو کە بنەچەی تلانەوەی ویژدانی هاوچەرخ لەو دابڕانەدایە کە لەنێوان ژیانو ئاییندایە، وەکو ئەوەی هیچ جۆرە پێوەندییەك لەنێوان موتەناهیو ناموتەناهی، یا لەنێوان زەویو ئاسماندا نەبێت. بۆیە لەڕوانگەی هیگڵ‌ەوە کاری سەرەکی مرۆڤ بەر لەهەرشتێك ئەوەیە کار بۆ فراوانکردنی ئایین بکات بەشێوەیەك هەموو ژیان بگرێتەوە، بەوەش دەتوانین هەموو حەقیقەتە موتەناهیەکانی جیهان بەبەهای ناموتەناهی داپۆشین. کەواتە بەبۆچوونی هیگڵ مانای وایە ئایین دەبێت بایەخەکانی تاکەکەس تێپەڕ بکات تاوەکو بتوانێت سەرجەم بایەخە باڵاکانی ژیانی مرۆڤ وەکو تاکێك لەخۆیەوە بگرێت و بەشداری لەم ژیانە کۆمەڵایەتییەدا بکات کە هیگڵ ناوی دەنێت (ڕۆحی گەل)(٨).

لێرەوە دەبینین هیگڵ ئایین تێکەڵاو بەژیانی کۆمەڵگا دەکاتو بڕیاری ئەوە دەدات کە پێداویستییەکی ڕۆحی هەیە خۆی بەسەر هەموو دیاردەکانی ژیانی ڕۆحی ئادەمیزاددا دەسەپێنێت، تەنانەت خۆی بەسەر ئایینیشدا دەسەپێنێت. ئەم پێوەندییەش کەئایین لەنێو هەموو کۆمەڵگایەکدا بەڕۆحی گەل دەبەستێتەوە، کار بۆ ئەوە دەکات کە دیاردەی ئایین بخاتە نێو ناوەڕۆکی سەیرورەتی مێژووییەوە. کاتێکیش ئایین پەیوەستی مێژوو دەبێت، ئەوە ئایین بەتەنیا وەکو ڕووداوێکی دەرەکی دەرناکەوێت کەبەهیچ شێوەیەك پێوەندی بەژیانەوە نەبێت، بەڵکو دەبێتە واقیعێکی هەمەکیو هەموو دیاردەکانی وجود لەنێو خۆیدا حەشار دەدات. مادام کاری سەرەکی ئایین ئەوەیە کە ئیرەیی تاکەکان لەناو ببات، ئەوە بۆیە ڕۆحی ڕاستەقینەی ئایینی دەبێت کار بۆ ئەوە بکات تاك لەنێو ژیانی کۆمەڵگا بتوێنێتەوە، ئەو کاتەش تاك دەتوانێت کۆنترۆڵی تاکگەرایی خۆی بکات کە لەسەر دابڕان بونیادنراوە تاوەکو بەشداری لەژیانی گشتیدا بکات کە دەبێتە هۆی ئەوە ئاسوودەییو ئارامیو دڵنەوایی ژیانی پێ ببەخشێت. بەبۆچوونی هیگڵ هەڵەی هەرە گەورەی نەزعەی عەقڵی توندڕەوانە





لەوەدایە ئیدراکی بەوە نەکردووە تاك جەوهەری کەسایەتیو بنەماکانی وجودی خۆی لەمێژووەوە وەردەگرێت(٩). لەم خاڵەدا دەبێت پرسیاری ئەوە لەخۆمان بکەین: ئایا هیگڵ هەموو توخمە کەسایەتییەکانی نێو ئایینی فەرامۆشکردووە بۆ ئەوەی تەنیا وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نمایشی بکات؟ لەواقیعدا هیگڵ تائەم ڕادەیەش نەچووە، بەڵام تێبینی ئەوەی کردووە ئەم ئایینەی مەسیح بانگەشەی بۆ دەکات، ئایینێکی تەواو تاکگەرا بووە، ئەوە لەکاتێکدا ناشێت حەقیقەتی پیرۆز لەنێو قووڵایی ویژدانی تاکدا زیندانی بکرێت، بەڵکو دەبێت بێتە دەرەوە بەرەو وجودی دەرەکی، ئەوەش تاوەکو هەموو شتێکی نێو ژیان لەخۆیەوە بگرێت. هەرئایینێك سەرکەوتوو نەبێت لە لەخۆگرتنی ڕوخساری گروپگەرایی وجودی مرۆڤ، دەبێتە هۆی ئەوەی جۆرە دابەشبوونێكو دابڕانێك لەنێو قووڵایی ویژدانی تاکدا بەرهەم بهێنێت.

ئەگەر ئایین ئەوەندە فراوان بوو بەشێوەیەك توانی ببێتە ئایینێك سەرجەم لایەنە ژیاریەکان لەخۆیەوە بگرێت-وەکو ئەوەی لای گریکەکان وابووە-ئەوە ئەو کاتە مرۆڤ لەسایەی ئەو کردەیەوە دڵسۆزی بۆ ژیانی بەکۆمەڵیو کۆمەڵگا پیشاندەداتو لەنێو ئەم ژیانەدا گوزەران دەکات، ئەوە ئەم ژیانە خۆی مۆرکێکی ئایینیانە وەردەگرێت. دواتر هیگڵ لەکۆتایی ئەم قۆناغەی پێشقەچوونی خۆیدا گەیشتە ئەو باوەڕەی ئایین تەنیا دیاردەیەکی عەقڵی نییە پەیوەستی ژیانو مێژووی کۆمەڵگا بێت، بەڵکو جگە لەوەش، ئایین ڕووداوێکی وەزعیانەیەو لەبارودۆخێکی دیاریکراودا بەدیهاتووەو پەیوەستی بارودۆخێکی تایبەتیشە، بۆیە دەبێت کار بۆ ئەوە بکرێت لەتوخمە پێویستو ئەبەدییەکانی نێو ئایین بگەینو لەو توخمانەش تێبگەین کە ڕووداوی زەمەنین تاوەکو پەیوەندی بونیادنراوی نێوان ئەم دوو جۆرە توخمە بناسین، ئەوەش ئەو کێشەیەیە کە لەقۆناغی دواتری پێشقەچوونی خۆیدا دەیوروژێنێت.





هیگڵ لەساڵی(١٧٩٣) بڕوانامەی دبلۆمی لاهوتی لەپەیمانگای توبنگن بۆخوێندنی ئایینی پرۆتستانتی وەرگرت، لەبارەی ئەم ماوەیەی خوێندنی خۆیدا دەنووسێت:" لەجیهاندا هیچ نەتەوەیەکی وەکو ئەوانە بوونی نییە کە ئەوەندە بە توندو بە وەفاییەوە دەست بە پرۆتستانتییەتەوە بگرن"(١٠). دوای تەواوکردنی خوێندنی لەتوبنگن، هیگڵ بۆماوەی سێ ساڵ چووە شاری بێرنو بوو بەمامۆستای تایبەتی یەکێك لەخێزانە دەوڵەمەندەکانی ئەم شارە. لەم قۆناغەی ژیانی هیگڵ-دا تێبینی ئەوە دەکەین کە مۆرکی بیرکردنەوەی دەگۆڕێتو زیاتریش تێڕادەمێنێتو دادەبڕێتو دەچێتە نێو قووڵایی بیرکردنەوەوە، دیارە لەم ماوەیەشدا زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری کانت، هەربۆیەش بەدیدو تێڕوانینێکی کانت-یانەوە دەڕوانێتەوە ئایینو پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات کە مەسیحییەت ئایینی ئازادیو تاکگەراییە. ئەوەش وای لێدەکات زیاتر لەئایینی مەسیحی بکۆڵێتەوە، بگرە ئەم بۆچوونە تازەیەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەو وردبوونەوەی زیاتری خۆیەتی لەئایینی مەسیحی. لێرەدا دێت لەژێر کاریگەری ڕۆحی گریکیانەدا بەراوردێك دەکات لەنێوان سوقراتو مەسیحەوەو لێکۆڵینەوەیەك دەنووسێت، لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە سوقرات بیریارێکی میللی بووەو تێکەڵاوی جەماوەر بووەو قوتابیانیشی پێویستیان بەوە نەبووە لەخەڵك دابڕێنو لەجیهان دوور بکەونەوە، کاری سوقرات تەنیا ئەوە بووە دەستیان بگرێتو ڕێنماییان بکات تاوەکو کەسایەتیان گەشە بکاتو ئازادبن. کەچی دەبینین لەبارەی مەسیحەوە پێی وابووە مەسیح خۆی وا لەبەردەم خەڵکدا پیشانداوە گوایە خاوەن دەسەڵاتەو هەڵگری پەیامێکی ئاسمانییە، جگە لەوەش ژمارەی قوتابییەکانی زۆر سنووردارو دیاریکراو بووە کە داوای لێکردوون پەیامەکەی بڵاوبکەنەوەو بەکۆمەڵانی خەڵکی بگەیەنن. لەم لێکۆڵینەوەیەشدا ئەوە دەردەکەوێت کە هیگڵ هێشتا تائەم کاتەش هەر لەژێر کاریگەری ڕۆحی گریکیدا بووەو زیاتر بەلای سوقراتدا دەیشکێنێتەوە، ئەگەرچی ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات





کە دەبوایە هەریەك لەسوقراتو مەسیح خۆیان لەگەڵ میللەتەکەی خۆیان بگونجێننو ڕەچاوی عەقڵییەتی خەڵك بکەن. زیاتریش پێدەچێت مەبەستی هیگڵ لەم باسە جەخت کردنەوە بێت لەسەر مۆرکی مێژووییانەی ئایین بەوسیفەتەی دیاردەیەکی گشتییەو سەرجەم ژیانی مرۆڤ دادەپۆشێت. ئەگەرچی ئەوەش بەدی دەکەین کەئەو لەنێو ئاییندا مۆرکی تاکگەرایی دەردەخات کە پێداویستی مرۆڤ بۆ ئازادی تێر دەکات، مۆرکی کۆمەڵگەرایی ئایینیش دەربڕی پێویستی مرۆڤە بۆ ئاوێتە بوون لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایەی لەنێویدا گوزەران دەکات.

هەر لەوماوەیەی ژیانی بێرن-دا، هیگڵ لێکۆڵینەوەیەکی تر لەبارەی پێشڤەچوونی هەستی ئایینی دەنووسێتو هەوڵدەدات لەسایەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هۆکارەکانی شڵەژانی باری ئایینی ڕاڤە بکات کە ئەوکات سەرتاپای جیهانی نوێی گرتبۆوەو ئەم هۆکارانەشی بۆ نەداری ئایین گێڕایەوە لەموسایەرەکردنی ڕۆحی جیهاندا لەکاتی پێشڤەچوونیدا. هیگڵ لەو باوەڕە دابووە کە لەم چرکەساتە مێژووییانەدا عەقڵ لەخەو هەڵساوەو خۆی داتەکاندووەو وریایە، ئایین هەروەکو خۆی ماوەتەوەو پێشڤە نەچووەو نەیتوانیوە لەقۆناغی منداڵیەوە بازبداتو بچێتە قۆناغی پێگەیشتنەوە. بەم شێوەیە هیگڵ ڕەخنەی زۆر ئاراستەی هەستی ئایینی مەسیحیانە دەکات، لەبەرئەوەی زۆر لەڕەگەزو توخمەکانی ئایینی یەهودی لەنێو خۆیدا هێشتۆتەوە، بۆیە پێی وایە دەبێت کار لەپێناو لەڕیشەکێشانی ئەم توخمانە بکرێت کە زیانیان بەرۆحی ئایینی مەسیحی گەیاندووە. جگە لەوانە، هیگڵ لەم ماوەیەدا کەسەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئایینی بووە، چەندین وتارو باسی تری نووسیوە لەبارەی پێوەندی ئایین بەئەخلاقو کاریگەری ئایین لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی ئەخلاقو بەها ئەخلاقییەکانی مرۆڤ. بەڵام هیگڵ پێی وایە ئایین ناکاتە ئەخلاق، چونکە لەنێو ئاییندا هەندێك توخمی ناعەقڵی بوونیان هەیە کە کار لەدڵو ویستی مرۆڤ دەکەن، بەڵام یارمەتیدەرن بۆ بەدیهێنانی نموونەی باڵای ئەخلاقی. لەهەمان کاتیشدا





هیگڵ ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە مەسیحییەت تەنیا لەڕوانگەیەکی ئەخلاقی پەتیانەوە ڕاڤە بکرێت، چونکە پێی وابووە بنەماکانی مەسیحییەت بەتەنیا بەس نین بۆ بزواندنی ویستی مرۆڤ، بەڵکو دەبێت لەپاڵ ئەوانەدا بڕوایەکی قووڵیش بەکەسایەتی مەسیح بوونی هەبێت، لەبەرئەوەی مەسیح بەتەنیا حەقیقەتێکی خودی نییە، بەڵکو گوزارشتە لەباڵاترین نموونەی ئەخلاقی، مەسیح کەسایەتییەکی ڕاستەقینەی مێژووییە کە ناوەڕۆکێکی بابەتیانە دەبەخشێتە نموونەی باڵا. بەم جۆرە لای هیگڵ ئایینی مەسیحی دوو توخمی دژە یەکتری لەناوەخۆیەوە دەگرێت، یەکەمیان توخمێکی عەقڵیو ئەخلاقییە، ئەویتریان توخمێکی ناعەقڵیو مێژووییە. بۆیە هیگڵ ڕەخنە لەوکەسانە دەگرێت کە مەسیحییەتیان کردۆتە چەند یاساو ڕێسایەکی چەقبەستوو(١١).

هەرلەم ماوەیەی ژیانی لەشاری بێرن-دا، هیگڵ لێکۆڵینەوەیەکی تری ئایینی دەنووسێت کەدواتر لەشێوەی کتێبێك بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناوی (ژیانی مەسیح). لەم کتێبەدا هیگڵ مەسیح وەکو کەسێکی ڕیفۆرمخوازی شۆڕشگێڕ پیشاندەدات کەبەدوای جیهانێکی نوێو تازەدا دەگەڕێت، وەکو ئەوەی مەسیح یەکێك بێت لەبانگەشەکارانی نەزعەی عەقڵی ئەخلاقی. لەبارەی ئەم کتێبەوە دەلتای گووتوویەتی:( ئەو ژیاننامەیەی کەهیگڵ بۆ مەسیحی نووسیوەتەوە، تەنیا لێکۆڵینەوەیەکی ئەخلاقییەو تێیدا هیگڵ کەوتۆتە ژێر کاریگەری مامۆستاکەی، کانت).(١٢) لەڕاستیدا ئەم کتێبە گوزارشت لەقۆناغێك لەقۆناغەکانی ژیانی هیگڵ دەکات، قۆناغی نێوان(١٧٩٠-١٨٠٠). هیگڵ ئەم کتێبەی لەساڵی(١٧٩٥)دا نووسیوە، بۆیە ڕاستە لەکاتی داڕشتنەوەی کتێبەکەدا هیگڵ بەتەواوی لەژێر کاریگەری تێڕوانینەکانی کانت دابووە لەبارەی ئایینەوە(١٣).

هیگڵ لەم کتێبەیدا زۆر ئازادانە بیر دەکاتەوە بەشێوەیەك هیچ گوێی بەئینجیلەکان نەداوە، زۆر بەسانایی هاتووە هەموو موعجیزەی نێو ئینجیلەکان بەلاوە دەنێتو باسیان لێوە ناکات، بۆیە کتێبی (ژیانی مەسیح)

وەرگـێڕانی ئینجـیل نیـیە بـۆ سـەر زمـانی ئـەڵمانی، چـونکە هـیگڵ خـۆی لەپەراوێـزێکدا ئامـاژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەم کتێبە" بریتییە لەگونجاندنی ئینجـیلەکان بەپـێی لـێکدانەوەو وەرگـێڕانی تایـبەتی خـۆی"(١٤). ئـێمە لەم کتێـبەدا ئـەوە بـەدی دەکـەین کـە هیگڵ ئاماژە بۆئەوە دەکات گوایە مەسیح بانگەشـەی مرۆڤی کردووە بۆ ئازادبوونو ملکەچی لەبەرامبەر ئەرکەکانداو ڕێزگـرتن لەیاسای ئەخلاقی بەبێ ئەوەی ئەوە لەیاد بکات کە مەسیح داوای خۆڕسکیو سادەییو مـەزنی مـرۆڤی کـردووە. ئـەوەش واتـا هـیگڵ لەنـێو کەسـایەتی مەسـیح-دا باشـترین گوزارشـت لەیەکێـتی نـێوان موتـەناهیو ناموتەناهـیدا بـەدی دەکـات. هـیگڵ لەوباوەڕەدایـە کاتـێك مەسـیح دەبێژێت مەملەکـەتی خـوا لەسـەر زەویـدا نایەتـە دی، تەنـیا بەهـەوڵو کۆششی ئـەو کەسانە نەبێت کە ڕێنماییەکانی عەقڵی کردارەکیانە پراکتیك دەکەن. ئەوە توانـیویەتی سـەرلەنوێ ڕێـزو کەرامـەتی مـرۆڤ بگێڕێـتەوە و ئازادی مرۆڤی نیشانداوە لەکارکردن لەپێناو دابینکردنی ئاییندەو چارەنووسی خۆیدا(١٥).

لەلێکۆڵیـنەوەیەکی تـریدا بـەناوی (ڕەوشـی ئاییـنی مەسـیحی) دەبیـنین هـیگڵ پرسـیار لـەبارەی ئـەو هۆکارانە دەکات کەوای لەمەسیحییەت کردووە لەئایینـێك کـە بانگەشەی ئازادیو خۆشەویستی دەکات، بگۆڕێت بۆ ئایینێك داوای دەسـەڵاتو کۆیلایـەتی دەکـات؟ لـەم نووسـینەدا شـێوازی هـیگڵ شـێوازێکی پڕ لەوێنەیە، شێوازێکی ڕەوانو ورد، بەیەکەوە ڕەخنە ئاڕاستەی هـەردوو کڵێسـای کاتۆلیکیو پرۆتستانتی دەکات، بگرە لەوەش زیاتر، ڕەخنە لـەخودی مەسـیح-یـش دەگرێـت، ئـەو ڕەخـنەیەش لەهـەندێك شـوێندا ڕەخـنەیەکی توونـدو زەقە(١٦). بۆیە دەبینین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کـە خـودی مەسـیح لەپێـناو ئـەوەدا هاتۆتـە جـیهان تـاوەکو مـرۆڤ لەدەسـت شـەریعەتەکان دەربـاز بکات، نەوەکو ئایینێکی نوێ دابهێنێت، یا ئەخلاقێکی تـازە بەرهـەم بێنێـت. لـەلای ئـەو ئامـانجو مەبەسـتی ئەسڵی مەسـیحییەت ئەوەبووە حاڵەتی ملکەچیو دەستەمۆیی مرۆڤ بۆ ویستێکی باڵا بگۆڕێت، بۆ کارکـردن لەپێـناو بەدیهێـنانی نموونەیـەکی بـاڵای مرۆڤایەتـیانە. لەهـەمان





کاتیشـدا هـیگڵ تێبیـنی ئـەوە دەکـات ویژدانـی مەسـیحیانە سـەرلەنوێ گەڕاوەتـەوە سـەر نەزعـەی یـەهودی بـۆ تیۆسـێنترالیزم-بەسـەنتەرکردنی خواوەنـد، بۆیـە هـیچ جـیاوازیەکی گـەورە لەنـێوان خـوای مەسـیحییەت و خـوای یەهودیـەتدا نەماوەتـەوە. هـیگڵ پـێی وایـە خودی مەسیح بۆخۆیشی تاڕادەیـەکی زۆر لـەم حاڵەتـە بەرپرسـیاربووە، چـونکە ناچـار بـووە بەپـێی عەقڵیـیەتی گەلەکـەی خـۆی قسـە بکـات، بەڵگـەش ئەوەیە پەیامەکەی خۆی لەسـەر بیرۆکـەی موعجـیزەو شـەیتانو بـڕوابوون بەمەسـیحی چـاوەڕوانکراو...تـاد، بونـیادناوە. ئـەم بۆچـوونو بیرۆکانـە لـەلای خـودی مەسـیح-دا ئـەوەندە بایەخـیان نـەبووە، بـەڵام قوتابـیانی پارێـزگاریان لـەم گوزارشـتانەی ئـەو کـردووە بەبێ ئەوەی دەسکاری بکەن، بۆیە ڕێنماییەکانی مەسـیحیان گـۆڕی بۆچـەند عەقـیدەیەکی چەقبەسـتوو بڕوای مەسیحیان وا لـێکرد تەنـیا پەیوەسـتی هـەندێك حەقـیقەتی ئایینـیو مەزهەبی بێت(١٧). ئەلێرەوە ژیانی ئەخلاقی لەبری ئەوەی لەسەر خۆڕسکیو زیندوویی عەقڵی کـردارەکی بونیادبنرێـت، هـات پشـتی بەڕێنمایـیەکانی کڵێسـا بەسـتا، بۆیـە مـرۆڤی مەسـیحی لـەکاتی ئـەنجامدانی هـەر کـارێکدا پرس بەویژدانی خۆی ناکـات، بـەڵکو دەگەڕێـتەوە سـەر ئـەو یاسایانەی پیاوانی کڵێسا دایانڕشتووە. بـەم شـێوەیەش هـەوڵو کۆششـی مەسیح لەپێناو ئازادکردنی مرۆڤ، گۆڕا بۆ دەستەمۆکردنی مرۆڤ لەسایەی یاسای توونـدو پتەودا.

هـەر لـەو ماوەیەشـدا هـیگڵ لێکۆڵیـنەوەیەکی تـری نووسـی لـەبارەی چۆنیەتی سـەرکەوتنی مەسـیحییەت بەسـەر بت پەرستیدا. بەمانای ئەوەی چۆن ئاییـنی مەسیحی توانی بەسەر ئایینی بت پەرستی گریکیدا زاڵ بێت، لەگـەڵ ئـەوەی بـت پەرسـتی زیاتـر لەگـەڵ سروشـتی مرۆڤایەتـیدا دەگونجا. هـیگڵ پـێی وایە ئایین بەشێوەیەك لەشێوەکان فرمانێکی کۆمەڵایەتییانەیەو لەهـەموو سـەردەمو چاخێکدا پەیوەسـتە بەڕەوشـی ژیـانی مرۆڤ. کاتێکیش لەژێـر دەسـەڵاتی ڕۆمانـیدا ڕەوشـی ژیـانی مـرۆڤ خـراپ دەبێـت، ئەوە مرۆڤ چـیتر ناتوانێـت لەنـێو بـت پەرسـتیدا ئـەو دڵنیایـیە بـەدی بکـات کـە پێشتر

هەبووە، بۆیە مەسیحییەت مژدەی دڵنیاییەکی تازەی بەمرۆڤ داوە ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی بەسەر بت پەرستیدا زاڵ بێت. هەر لەوکاتانەشدا هیگڵ شیعرێك دەنووسێتو بەدیاری پێشکەشی هۆڵدرلین‌ی دەکات، ناوی شیعرەکە (ئیلیۆسیس) دەبێتو شیعرێکی نیمچە سۆفیانەیەو بۆ ئەو ڕۆحە هەمەکیەی گوتووە کە هیگڵ ڕۆچووەتە ناوەوەی و سەرسوڕمانە پێی. بەهەرحاڵ لەم سێ ساڵەی ژیانی لەشاری بێرن‌دا، هیگڵ بەیەکجاری دەسبەرداری بیرۆکەی ئایینی سروشتی بوو، زیاتریش بایەخی بەلێکۆڵینەوە دەدا لەتوخمە مێژووییەکانی نێو ئایین. بۆیە لێرەدا چیتر بەدوای ئەوەدا ناگەڕێت ئایین بکات بەدیاردەیەکی عەقڵی، بەڵکو بەپێچەوانەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئایین هیچ ڕۆژێك بەبێ توخمی خۆڕسك و تێپەڕ نەبووە.

لە کانوونی دووەمی ساڵی(١٧٩٧)دا هیگڵ لەسەر داوای هۆڵدرلین شاری بێرن جێدەهێڵێتو ڕوودەکاتە شاری فرانکفۆرت تاوەکو لەوێش ببێتە مامۆستای تایبەتی یەکێك لەماڵە بازرگانەکانی ئەم شارە. هیگڵ تاوەکو ساڵی(١٨٠٠) لەفرانکفۆرت مایەوە، تائەوکاتەی لەکۆتاییەکانی ساڵی(١٧٩٩)دا هەواڵی کۆچی دوایی‌کردنی باوکی پێگەیشت. دوای مردنی باوکی کەمێك میراتی بۆمایەوەو دەسبەرداری وانە گوتنەوە بوو خۆی بۆخوێندن تەرخان کردەوە. زۆر لەلێکۆڵەرەوان پێیان وایە ژیانی ئەم سێ ساڵەی هیگڵ لەشاری فرانکفۆرت سەردەمی ژیانی ڕۆمانتیکیانەیەتیو لەژێر کاریگەری ڕۆمانتیکییەتدا بووە، ئەوەش لەبەر هاوڕێیەتی بەتینی لەگەڵ هۆڵدرلین-دا، بەڵام ناشێت ئەم کارانەش بەکاری تەواو ڕۆمانتیکی دابنرێن. دیارە ئێمە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەمان لەقۆناغەکانی ژیانی هیگڵ‌دا ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە کە هەریەك لەڕەوتی ڕۆمانتیکیو سەردەمی ڕۆشنگەری کاریگەرێتییان لەسەر بیرکردنەوەی هیگڵ جێهێشتووە، بگرە بوونەتە هۆی بەپیت بوونی هزرو تێڕوانینی هیگڵ، بەڵام دەبوایە ئەو لەوەش هەورازتر بڕوات، تاوەکو بتوانێت گونجانێكو تەبایەك لەنێوان پەیامی







شۆڕشگێڕانەی ڕۆمانتیکەکانو هزرە هێمنو سەنگینەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری بەدیبێنێت. ئەو هەوڵیدا شێوەیەك لەگونجان، فۆرمێك بۆ تەبایی لەنێوان ئەم دوو هاوکێشەیەدا بدۆزێتەوە، بۆیە هەوڵیدا ڕۆمانتیکییەت بەعەقڵانی بکاتو سەردەمی ڕۆشنگەریش بەرۆحانی بکات. دەتوانین بڵێین هیگڵ لەتێڕوانینی بۆ یەکێتی دژەکان کەسێکی ڕۆمانتیکی بووە، بەڵام لەبارەی چۆنیەتی بەدیهێنانی ئەم یەکێتییەدا دژی ڕۆمانتیکییەت بووە، چونکە پێی وابوو یەکێتی دژەکان دەبێت بەشێوەیەکی عەقڵییانە بێتە دی نەوەکو بەشێوەیەکی ڕۆمانتیکیانە(١٨).

هەر لەماوەی ژیانی لەفرانکفۆرت‌دا، هیگڵ لێکۆڵینەوەیەکی تری لەبارەی ئایینی یەهودی نووسی. لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵیدا ئایینی یەهودی وانمایش بکات وەکو ئەوەی ئایینێکی کۆیلایەتیانە بێت، بەم شێوەیەش وەسفی پیاوی یەهودی دەکات:( پیاوێکی نامۆیە، دابڕاوە، بێ وڵاتو بێ نیشتیمانە، زۆر هەست بەوە دەکات کەپێویستی بەخواوەندێك هەیە پشتی پێ ببەستێتو بیپارێزێت)(١٩). نیشاندانی پیاوێکی یەهودی بڕوادار بەم شێوەیە، واتا نیشاندانی ئایینی یەهودی بەوەی کە ئایینێکی دابڕاوەو بێ نیشتیمانو بێ خاکە، ئەوەش زیاتر لەوەوە دێت کە موسا کۆچی کردووەو وڵاتی خۆی جێهێشتووەو دابڕاوە لەنیشتیمانو خاکی خۆی. ئەو دابڕانەی خودی موسا لەلایەن هیگڵ‌ەوە گشتگیر دەکرێتو بەسەر ئایینی یەهودیدا پراکتیك دەکرێت. هیگڵ وەکو نموونەیەك باس لەئیبراهیم پێغەمبەر دەکات، وەکو ئەوەی نموونەی پیاوێکی یەهودی بێت. ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە ئەو تەنیاییە سەختەی ئیبراهیم تێیدا ژیاوە پاڵی پێوەناوە هەمووشتێکی خۆی بداتە دەست خواو ویستی خۆی لەدەستداوە، چونکە لێرەدا لەلای هیگڵ، ئیبراهیم خۆی تەسلیم بەخواوەند کردووەو خۆی لەدەستداوە. هیگڵ دەنووسێت:" لەگەڵ ئیبراهیم‌باپیرە گەورەی یەهود-مێژووی ئەم گەلە دەست پێدەکات، ڕۆحی ئیبراهیم فاکتەری یەکێتی یا ڕۆحی ڕێکخەری سەرجەم نەوەکان بووە، بەچەندین شێوەی جیاوازیش

لەململانێ لەگەڵ هێزە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت، هەندێکجار بەسەریاندا زاڵ دەبێتو هەندێکجاریش دەکەوێتە ژێر دەستیان، شتێکی وامان بۆ نەماوەتەوە کە نیشانی پێشڤەچوونی ژیانی مرۆڤمان بۆ بکات بەر لە ئیبراهیم، ئەگەرچی ئەو ماوەیە گرنگیشە، چونکە کۆمەڵێك گروپو کۆمەڵە مرۆڤ کە بەژمارە کەم بوون بەشێوەیەك دەژیان کە خۆیان دابووە دەست سروشت"(٢٠). ئەلێرەوە دوای نمایشکردنی ژیانی ئیبراهیم، هیگڵ دەگاتە ئەو بڕوایەی کە پێوەندی پیاوی یەهودی بەخواوەند، پێوەندییەکی پۆزەتیڤ نییە، بەڵکو پێوەندییەکی نێگەتیڤانەیە، پێوەندییەکە لەسەر هاریکاری کردن بونیاد نەنراوە، بەڵکو لەسەر کۆیلایەتیو گوێڕایەڵی بونیادنراوە. بەم شێوەیی هیگڵ ڕەگوڕیشەی ئەم کۆیلایەتییەی نێو ئایینی یەهودی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە ئایینی یەهودی ئایینێکی خۆرهەلاتیانەیە، خۆرهەلاتیش لای ئەو لەسەر سەرکوتکردنو کۆیلایەتی بونیادنراوەو بەڕێوە دەبرێت. هیگڵ پێی وایە بەتێڕامانێك لەژیانی ئیبراهیم خەلیل مرۆڤ درك بەوە دەکات کە ئەو پیاوە ئامادە بووە لەپێناوی خوادا قوربانی بەهەموو شتێك بدات، تەنانەت ئیسماعیل-ی کوڕی خۆیشی، ئەوەش لای هیگڵ قوربانیدانە لەپێناو بابەتێکی بالاتر، ئەویش ئەوەیە ئیبراهیم بۆ قوربانی بەکوڕەکەی دەدات؟ بۆ ئەوەی خوا بیپارێزێتو دەستی پێوە بگرێت. ئەو تەنیاییەی ئیبراهیم خەلیل تێیدا ژیاوە ناچاری کردووە لەخوا بەولاوە نەتوانێت پشت بەکەسی تر ببەستێت(٢١).

لێرە لەنێو ئەم نووسینەدا، هیگڵ دێت قۆناغەکانی پێشڤەچوونی ڕۆحمان بۆ شی دەکاتەوە، قۆناغی یەکەم کە دەکرێت بەقۆناغی سروشتی ناوی ببەین، چونکە مرۆڤ بەشێوەیەك ژیاوە تەواو خۆی داوەتە دەست سروشتو ڕۆحیش لەنێو سەکینەتدا ژیاوە. دواتر تۆفان دێت، سەردەمی نوحو تۆفانی گەورە، تۆفان مرۆڤی دووچاری سەرسوڕمانێکی قووڵو گەورە کرد، بەم شێوەیەش یەکەم گونجانی نێوان سروشتو مرۆڤ تێکشکا، مرۆڤ لەمە بەدواوە چیتر متمانە بە سروشت ناکاتو لەنێو دوودڵیو





بیرکردنەوەدا دەژی، ئەو جۆرە لەتێڕوانینە بۆ سروشت گوایە هێمنو جێگیرە، گۆڕا بۆ گومانو بێ متمانەییەکی قووڵ، بۆیە مرۆڤ هەستی کرد دەبێت سروشت کۆنترۆڵ بکات. کەواتە یەکێتیو تەماهی نێوان مرۆڤو سروشت داڕماو تێکچوو، بەلام ڕۆح سەرلەنوێ هەوڵیدا ئەم دابەش بوونو تێکچوونە چاك بکاتەوە، ئەوەش ئەوکاتە هاتە دی کاتێك هزر بەسەر سروشتدا سەرکەوتو لەڕێگای هزرەوە نوح سەرلەنوێ دونیایەکی تازەی بونیاد نایەوە. کەواتە ئەوە سێ قۆناغی بەدوایەکدا هاتووی ڕۆحە لەململانێی لەگەڵ سروشتدا، قۆناغی یەکەم قۆناغی یەکێتییەکی سادەو ساکارە لەگەڵ سروشتدا. قۆناغی دووەم قۆناغی تۆفانو تێکچوونی ئەم یەکێتییە سادەو ساکارەیەو سەرهەڵدانی وشیارییە. قۆناغی سێیەم قۆناغی سەرلەنوێ گێڕانەوەی یەکێتییە لەڕێگای هزرەوە یا سەرکەوتنی ڕۆحە بەسەر سروشتدا. ئەوانە قۆناغی ململانێی ڕۆحن لەگەڵ سروشتدا، یا ململانێی نێوان هزرو وجودە. ئەوەش ململانێیەکە بەسەرکەوتنی هزر کۆتایی دێتو تێیدا هزر کۆنترۆڵی وجود دەکات(٢٢).

دواتر هیگڵ دێت باسێکی تر لەبارەی مەسیحییەت دەنووسێت لەژێر ناوی (ڕۆحی مەسیحییەتو چارەنووسەکەی). لێرەدا لای هیگڵ چارەنووس بەمانای هەموو ئەو بارودۆخە مێژووییانە دێت کە حوکم لەشێوەی ژیانی مرۆڤایەتی دەکەن. لەم باسەدا زیاتر جەخت دەکاتە سەر قەدەر-چارەنووسو دێت خوێندنەوەیەکی مێژووییانە بۆ تێڕوانینو مامەڵەکردن لەگەڵ چارەنووس ئەنجام دەدات. لەلای یۆنانییەکانەوە دەست پێدەکاتو بەیەهودییەت تێپەر دەبێتو دەگاتە مەسیحییەتو زیاتریش قسە لەبارەی چارەنووس لەلای مەسیح دەکات، لەبەرئەوەی هیگڵ پێی وایە هەڵوێستی مەسیح لەبەرانبەر قەدەر هەڵوێستی مرۆڤێکی موتەکامیلە کە نازانێت هەڵەو گوناه چییەو هەرگیز ئەنجامی نەداوە، بۆیە مەسیح کاتێك لەسەر خاچ بەرگەی ئەم هەموو ئێشو ئازارە دەگرێت، بەرگەی مردن دەگرێت، ئەوە لای هیگڵ سەرکەوتنێکی ڕاستەقینەی مەسیحە بەسەر قەدەردا،

چونکە لەم ڕێگایەوە توانی ئازارو مردن بکات بەشێوازێك بۆ یەکبوونو توانەوە لەنێو خواوەنددا. ئەلێرەدا دەبینین جارێکی تریش دێت ڕەخنە ئاڕاستەی ئایینی یەهودی دەکاتەوە(٢٣). لەڕاستیدا هیگڵ هەموو دەرفەتێك دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی تێیدا ڕەخنە لەیەهودییەت بگرێت، ناکرێت ئەوەش لەیاد بکەین کە ئەو وەکو مرۆڤێکی مەسیحی بیر دەکاتەوە، لەوەش زیاتر ئەو خوێندنە لاهوتییەی سەردەمی لاوێتی دووچاری جۆرێك لەڕقو قینەی کردووە لەئاست ئایینی یەهودیدا، ئەو کاتێك مەسەلەکە دێتە سەر ئایین، بەرلەوەی هەر شتێك بێت، پیاوێکی مەسیحییە، پیاوی مەسیحیش بەم شێوەیە بیر دەکاتەوە-بەلایەنی کەم لەو سەردەمەی ژیانی هیگڵ-دا. ئەم نەزعەیە بۆ دژایەتی کردنو ڕقو قینە هەڵگرتنو بەکەم زانینی یەهودو ئایینی یەهودی بووە هۆی ئەوەی سەدەیەك دواتر ئەڵمانیا ببێتە ئەو وڵاتەی هۆلۆکۆستی تێدا ئەنجام دەدرێت، کەواتە ڕقو قینە بەرانبەر بە یەهود لەنێو کولتووری مەسیحیانەی ئەڵمانییەکاندا ڕەگو ڕیشەی قووڵی هەیە، سەرەتاکانیشی لەگەڵ هیگڵ دەست پێناکات، بەڵکو هیگڵ تاکە وێستگەیەکە لەنێو کولتوورێکی پڕ لەڕەگەز پەرستیدا. هەر لەنێو ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا، هیگڵ جەخت دەکاتە سەر بیرۆکەی هەڵەکردنو دەیکاتە تەوەرەی سەرەکی بیرکردنەوە ئایینیەکانی خۆی. ئەوە لەکاتێکدا پێشتر ئەم خاڵەی بەلاوەنابوو ڕەتی دەکردەوە. ئەلێرەشدا دێت بیرۆکەی هەڵەکردن بەبیرۆکەی قەدەر-چارەنووس دەبەستێتەوەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لێخۆشبوون لەهەڵەکان مانای ئەوە نییە هەموو ئەو ئێشو ئازارانەش دەسڕێنەوە کە ئەنجامی هەڵەکەیە، بەڵکو مانای وایە کەدەبێت ئێمە قبووڵی ئەم ئێشو ئازارە بکەینو جۆرێك لەڕێکەوتن لەگەڵ چارەنووسدا بەدی بێنین(٢٤). جگە لەوەش تەوەرەیەکی هەرە گرنگی ئەم نووسینەی قسە کردنە لەبارەی چەمکی خۆشەویستی، ئەوەش بەپشت بەستن بە دواخوانی مەسیح لەگەڵ هاوڕێیانیدا- دواتر ئەم خوانە لای مەسیحییەکان دەبێتە جەژنی خۆشەویستی-واتا ئەو ئێوارەیەی مەسیح لەنێو هاوڕێیانی





دادەنیشێتو نانیان لەگەڵ دابەش دەکاتو بەیەکەوە نان دەخۆن. ئەگەر بگەڕێینەوە سەر کتێبی(ژیانی مەسیح)و هەوڵبدەین بەپێی ئەو چیرۆکەی هیگڵ لەم شەوە ڕابمێنین، ئەوە دەبینین مەسیح زووتر هەست دەکات ئەوە دواخوانیەتی لەگەڵ هاوڕێکانی، بۆیە هەوڵدەدات هەندێك ئامۆژگاری گرنگیان پێشکەش بکات. لەسەرەتای دانیشتنەکەدا مەسیح خۆی هەڵدەستێتەوەو عەباکەی لەبەردەکاتەوەو پێیەکانی خۆی هەڵدەکاتو دەست دەداتە پارچە قوماشێکی تەڕو یەکە بە یەکە پێی هاوڕێکانی دەشوات، بێگومان ئەوەش کارێکە بەردەوام خزمەتکارەکان ئەنجامیان دەدا، بەڵام ئەمجارەیان مەسیح خۆی بەم کارە هەڵسا، دەبینین هەموو هاوڕێکانی پێی خۆیان دەدەنە دەستی مەسیح تاوەکو بۆیانی بشوات، تەنیا پەترۆس نەبێت کە پێیەکانی خۆی ناداتە دەست مەسیح-بێگومان دواتر کاتێك مەسیح دەسگیر دەکرێت تاوەکو لەخاچ بدرێت دەبینین پەترۆس خۆی لێ نەناس دەکاتو ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە ئەو پیاوە بناسێت-بەپێی هەمان دەقی نووسراوی هیگڵ. دوای ئەوەی تەواو دەبێت مەسیح پێیان دەڵێت:" بینیتان چیم کرد، من، کە بەمامۆستا ناوم دەبەن، پێی ئێوەم شووشت، ویستم پەندێکتان پێبدەم لەبارەی ئەو شێوازەی کە دەبێت لەنێوان خۆتاندا ڕەفتاری پێبکەن. میرەکان حەزیان بەدەسەڵاتە، بۆیە خۆیان وا پیشان دەدەن کە کاری چاکە بۆ مرۆڤایەتی ئەنجام دەدەن، ئێوە وەکو ئەوان مەبن. هیچ کەسێك لەئێوە هەوڵنەدات دەسەڵاتی بەسەر کەسانیتردا بسەپێنێت، هیچ کەسێك لەئێوە مەبەستی نەبێت بەسەر ئەوانیتردا باز بدات، با هەر یەکێك لەئێوە خزمەتکارو نەرم بێت، وەکو چۆن لەنێوان هاوڕێیاندا هەیە، کاتێکیش خزمەتێك پێشەکش دەکات، وای پیشان نەدات کە خێری کردووە یا لەبەردەم کەسانیتردا تەنازولی کردووە"(٢٥) لەم ئێوارەیەدا مەسیح پارچەیەك نان هەڵدەگرێتو بەسەر ئامادەبوواندا بەشی دەکات(٢٦). ئەم دوا خوانەی مەسیح لەگەڵ هاوڕێیانیدا زیاتر مەبەست ئەوەیە گەشە بەرۆحی خۆشەویستیو هاریکاری نێوانیان بداتو فێری سادەییو





دڵنەرمیان بکات، مەسیح مەبەستییەتی هەستی خۆشەویستی نێوانیان پتەوو بەهێزتر بکات، چونکە دەزانێت ئەوە دوا پەندە دەتوانێت پێیانی بدات. لەڕاستیدا پارچە پارچە کردنی نانێك و بەخشینەوە بەسەر کەسانیتردا مەسەلەیەکی ڕەمزییە بۆ هاوکاریو خۆشەویستیو تەبایی، ئەوە مەسەلەیەکە لەلایەنی رۆحییەوە مانایەکی قووڵو گەورەی هەیە، هیگڵ جەخت دەکاتە سەر ئەو مانا قووڵو گەورەیەی مەسیحییەت. بۆیە بەیەکەوە خواردن یا بەیەکەوە خواردنەوە، مەسەلەیەکە لەوە گەورەترە هەر تەنیا خواردنو خواردنەوە بێت، ئەوە مەسەلەی نمەك کردنە وەکو ئەوەی لەنێو هەموو گەلێکدا هەیە، دوای ئەم نمەك کردنە کۆمەڵێك پێوەندیو هەستی هاوبەش دروست دەبێتو سەرهەڵدەدات، کۆمەڵێك شت قەدەغە دەکرێت، خیانەتو داوێن پیسیو درۆکردنو فڕتو فێڵو....تاد، هەموو ئەوانە دەبێت بەلاوە بنرێن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مەسیح دەزانێت ئەم کارەی ئەو ناتوانێت هەموو ئەوانە لەنێو دڵی خۆفرۆشو خیانەتکاران بسڕێتەوەو بەلاوەیان بنێت، بۆیە دەڵێت:" یەکێك لەوانەی لەگەڵ مندا نان دەخۆن، پێی بەسەر مندا بەرز دەکاتەوە-مەبەستی یەهودایە-چونکە یەکێك لەئێوە من بەدەستەوە دەدات"(٢٧). جگە لەوەش کاتێك بەهاوڕێکانی دەڵێت چارەنووسی نزیك بۆتەوەو خەریکە دەچێتە دونیایەکەی تر، پەترۆس لێی دەپرسێت:" دەتەوێت بڕۆیتە کوێ؟ گەرەکتە جێمان بێڵیت؟". مەسیح وەڵامی دەداتەوە:" تۆ ناتوانیت لەو ڕێگایەدا هاوڕێیەتیم بکەیت کە من دەیگرمە بەر". کەچی دەبینین پەترۆس واز ناهێنێتو خۆی هەڵدەکێشێتو دەڵێت:" بۆ ناتوانم لەگەڵت بم، من ئامادەم ژیانی خۆم لەم پێناوە دابنێم". مەسیحیش وەڵامی دەداتەوە:" دەتەوێت ژیانی خۆت بکەیتە قوربانی لەپێناوی مندا؟ من دەزانم تۆ هێشتا هێزی ئەوەت تێدا نییە کارێکی وا بکەیت. دەکرێت بەرلەوەی خۆر هەڵبێت تاقی بکرێیتەوە"(٢٨). ئەوەبوو دواتر کاتێك یەهودا شوێنی مەسیح ئاشکرا دەکاتو لەبەرانبەردا هەندێك پارە وەردەگرێت، مەسیح-یش







بەقۆڵبەستراوی دەبردرێتە کۆشك، پەترۆس خۆی لێ نەناس دەکات. لەولاشەوە یەهودا کاتێك هەستیکرد کارێکی خراپی ئەنجامداوە، پارەکە دەداتە دەست کاهینەکانو خۆی دەکوژێت. بەم جۆرە هیگڵ لەم نووسینەیدا دێت قسە لەبارەی خۆشەویستیو هاریکاریو چارەنووسی مەسیحییەت دەکات. لەڕاستیدا گرنگی لێکۆڵینەوە لەم قۆناغەی ژیانی هیگڵ لەفرانکفۆرت، لەوەدایە کە سەرەتاکانی فەلسەفەی هیگڵ لەبارەی هزرو بیرۆکەی ڕەها دەردەکەوێت، چونکە لەنێو نووسینەکانی فرانکفۆرتدا هیگڵ باس لەوە دەکات کە موتەناهی هیچ مانایەکی نییە، تەنیا لەپێوەندی لەگەڵ ناموتەناهیدا نەبێت. جگە لەوەش دەبینین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەموو ئەوشتانەی لەنێو وجوددا بوونیان هەیە کایەیەکن لەکایەکانی حەقیقەتی هەمەکیو کاری سەرەکی فەلسەفەش ئاشکراکردنو دۆزینەوەی حەقیقەتی هەموو شتێکە، یا دۆزینەوەی پێوەندییە لەگەڵ هەمەکیدا. لەم قۆناغەدا سەرەتاکانی داڕشتنی فەلسەفەکەی هیگڵ دەردەکەوێت، کاتێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەواقیعی عەینی ئاشکراکردنی ڕەهایە، ڕەهاش بریتییە لەژیان، ژیانیش بەپێی ڕیتمێکی تایبەتی خۆی بەڕێوەدەچێت کەلەسەر دژکاری کردنی خودی خۆی بونیادنراوە(٢٩).

لەساڵی(١٨٠١)دا هیگڵ گواستیەوە بۆشاری یێنا، ئەوکاتەش شلینگ-ی هاوڕێی ببووە مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی یێنا، بۆیە هیگڵ دەستیکرد لەفەلسەفەی شلینگ-ی کۆڵیەوە. ئەوەبوو یەکەم کاری فەلسەفی نووسی کە لەژیانیدا چاپکرا بێت، ئەویش بەناوی (جیاوازی لەنێوان مەزهەبی فیختەو مەزهەبی شلینگ) بوو کە لەتەموزی ساڵی(١٨٠١)دا بڵاوکرایەوە. بیرۆکەی سەرەکی ئەم کتێبە ئەوەبوو کە پێویستە کار لەپێناو ئەوەدابکرێت هەموو جۆرە دژکاریو ناکۆکیەك لەناوببردرێت، ئەوەش لەپێناو ئەوەنا تاوەکو بگەین بەیەکێتیەکی عەقڵی ئەپستراکتو وشك، بەڵکو بۆ گەیشتن بەیەکێتیەکی زیندوو بەپیت کە هاوکات لەناوەخۆیدا خودی جیاوازیو دژکاریو دوو بەرەکیش هەڵبگرێت. هیگڵ تێبینی ئەوەی کردبوو

فەلسەفەی ئەڵمانی لەوکاتانەدا ببووە قوربانی جۆرێك لەدابڕانو درزو کەلێنو ناکۆکی، ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی درزێك لەنێوان عەقڵو واقیعدا بێتە دی بەشێوەیەك نەتوانرێت پڕ بکرێتەوە. ئەم دابڕانو کەلێنە ئەنجامی خودی کردەی ژیانە، لەبەرئەوەی کاتێك ژیان خودی خۆی تەبەنی دەکات، ئەوە لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ خودی خۆیدا دژکار دەبێت، ئەنجامدانی یەکێتیەکی زیندوو حەقیقی نایەتە دی تەنیا لەکاتی دووره دەستی نەبێت لەهەموو دابڕانێك(٣٠).

لەهەمان ئەم ساڵەشدا، باسێکی پێشکەشی زانکۆی یێنا کرد لەبارەی (سوڕی هەسارەکان)، تێیدا بەتووندی هێرشی کردە سەر نیوتنو ڕەخنەی زۆری ئاڕاستەکردو هەوڵیدا بەشێوازێکی پێشینەییانە ئەوە بسەلمێنێت کە هیچ هەسارەیەك لەنێوان موشتەریو مەریخ‌دا بوونی نییە. هیگڵ ئەم باسەی لەئابی ساڵی(١٨٠١)دا پێشکەشکرد، کەچی دوای ئەوە بەماوەیەکی زۆرکەم هەر لەهەمان ئەم ساڵەشدا هەسارەی سیریس لەنێوان موشتەریو مەریخ‌دا دۆزرایەوەو تیۆرەکەی هیگڵ پووچەڵ دەرچوو. بەڵام هیگڵ لەپەنای ئەم باسەیدا گەرەکی بوو مەبەستێکی تر بپێکێت، ڕاستە باسەکەی ئەو ڕاست دەرنەچوو تیۆرەکەشی شکستی هێنا، بەڵام ئەو گەرەکی بوو جەخت لەسەر تێڕوانینە هەمەکییە تۆتالیتارییەکەی خۆی بکاتەوە لەبارەی گەردوونەوە. ئەم باسە دژی بۆچوونە ماتماتیکییەکەی نیوتن بوو، لەبەرئەوەی نیوتن قوربانی بەمۆرکی چۆنایەتی گەردوون دابوو، بۆیە هیگڵ دەیویست ئەو مۆرکە چۆنایەتیو هەمەکییە بگێڕێتەوە(٣١). جگە لەوەش هیگڵ چەندین وتاری لەگۆڤاری ڕەخنەییدا بڵاوکردەوەو تێیدا هێرشی کردەسەر ئەو نەزعە فەلسەفیانەی کە مەبەستیان بوو واقیع بەش بەش بکەنو دژکارییەکی سەخت و یەکلاکەرەوە لەنێوان موتەناهیو ناموتەناهیدا بونیاد بنێن. لێکۆڵینەوەیەکی بڵاوکردەوە لەژێر ناوی(لەبارەی جەوهەری فەلسەفەی ڕەخنەییەوە)، وتارێکی تریشی بڵاوکردەوە بەناوی (فەلسەفەی هەستی هاوبەش)، وتارێکی تریشی





بڵاوکردەوە لەژێر ناوی(پێوەندی خولیای گومانکاری بەفەلسەفەوە)، تێیدا قسە لەبارەی نەزعەی گومانکارییەکان دەکات. لێکۆڵینەوەکی تریش بڵاو دەکاتەوە لەژێر ناوی(ڕێگا زانستییەکان بۆ باسکردنی مافی سروشی). ڕەنگە گرنگترین باس هیگڵ لەم ماوەیەدا نووسیبێتی ئەو لێکۆڵینەوەیە بوو بێت کە بەناوی (ئیمانو مەعریفە) بوو لەساڵی(١٨٠٢)دا نووسیویەتیو هەر لەم گۆڤارە ڕەخنەییەشدا بڵاوی کردۆتەوە(٣٢). لەم باسەدا هیگڵ هەوڵیداوە شێوە گونجانێك لەنێوان مرۆڤی ئیماندارو فەلسەفەکار بخولقێنێت، بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێت بڕوای ئایینی قابیلی بەعەقڵانی کردن بێت، دەبێت شێوەیەك لەگونجاندن هەبێت لەنێوان شتە خودیو بابەتییەکاندا، ئەوەش مەسەلەیەکە ئەستەمە بێتەدی، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە ئەوە دەزانین مەبەستی ئایینو مەبەستی فەلسەفە یەك مەبەستە، چونکە هەردووکیان مەبەستیانە جۆرێك لەیەکێتی لەنێوان مرۆڤو خواوەند بەدی بێنن، هەستێکی ڕوونو ئاشکرا بە بەرجەستە بوونو قوربانیدان، کەواتە دیارە ئەرکی فەلسەفە زۆر لەئەرکی ئایین جیاواز نییە، چونکە گەرەکیانە دابەشبوونو دابڕان لەناوبەرن. تاکە جیاوازی نێوان ئایینو فەلسەفە ئەوەیە ئایین بەشێوەیەکی عەینی مێژووییانە گوزارشت دەکات، کەچی فەلسەفە بەشێوەیەکی تیۆری وێناکراو گوزارشت دەکات(٣٣).

ئەگەر بەوردی بڕوانینە نووسینەکانی ئەم قۆناغەی پێشڤەچوونی هزری هیگڵ، ئەوە بەدی دەکەین زۆربەی نووسینەکانی دژایەتی دوالیزمی دەکات، بەتایبەتیش دژی ئەو فەلسەفەکارانە دەوەستێتەوە کەئیمان دەخەنە بەرانبەر عەقڵو بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە ڕەها بابەتی ئیمانە، نەوەکو بابەتی مەعریفە بێت. بانگەشەی ئەوە دەکەن کە وجود هیچ داڕشتنێکی زارەکی یا گوزارشتێکی وێناکراو قەبووڵ ناکات. لێرەدا ڕەخنەکانی هیگڵ زیاتر ئاراستەی هەریەك لەکانتو فختەو جاکۆبی دەکرێت، چونکە پێی وایە ئەوانە هاتوون مەعریفەیان لەئیمان دابڕیوە، وەکو ئەوەی کاری

فەلسەفە لەبەرانبەر ڕەها تەنیا بێدەنگی بێت. گەڕانەوەیەکی ورد بۆ وتارو لێکۆڵینەوەکانی سەردەمی یێنا، ئەوە دەردەخات کە هیگڵ بەکردەییانە دەستی کردووە کێشەی ئاوێتە بوونو بەرجەستە بوونی ناموتەناهی لەنێو موتەناهیدا دەووروژێنێت، بۆیە دێت لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی وتەزای چەندایەتیو چۆنایەتی دەنووسێت، دواتریش دێت لەبیرۆکەی ناموتەناهی دەکۆڵێتەوە. هیگڵ دێت پرسیار لەبارەی ئەوە دەکات چۆن دەکرێت گونجاندنێك لەنێوان هیلینیزمو مەسیحییەت ئەنجام بدات، یا گونجاندنێك لەنێوان جیهانو خوادا، یا لەنێوان موتەناهیو ناموتەناهیدا، بۆیە چەندین چارەسەری بۆ ئەم کێشەیە دەخاتە ڕوو، وەکو ئەو چارەسەرییەی ڕەوتی ڕۆمانتیکیو چارەسەری فەلسەفەکارە عەقڵانییەکان پێشکەشی دەکەن.

هەر لەم ماوەیەشدا، هیگڵ دێت لەبیرۆکەی جەوهەرو شیکردنەوەی کردەی پێوان ئەنجام دەدات، کار لەسەر سروشتی مەعریفە دەکاتو جەخت دەکاتە سەر پرنسیبی شوناسو لەچەمکی نەفس-دەروون دەکۆڵێتەوەو قسە لەبارەی ڕۆحی ڕەها دەکات. دواتریش دێت لێکۆڵینەوەیەك لەژێر ناوی (میتافیزیکای بابەتی) دەنووسێت. لەم لێکۆڵینەوەیەشدا چەمکی دەروون شی دەکاتەوە بۆئەوەی پیشانی بدات کە لەدوولایەنی پۆزەتیڤو نێگەتیڤ پێکدێتو بزاڤێك لەناوەخۆیەوە دەگرێت لەموتەناهیەوە بۆ ناموتەناهی، ئەوەش لەسایەی نەزعەیەك ڕووەو بالأبوونی یا بەزاندنی بەردەوام. هیگڵ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ڕۆحی ڕەها لەنێو قوولأیی سەیرورەتدایە، ئەوەش پیشاندەدات کەژیانی ئەم ڕەهایە لەناوەرۆکدا بریتییە لەبالأبوونو بەزاندنێکی بەردەوامو دۆزینەوەی خود. ئەوەش مانای وایە ڕەها قۆناغ بە قۆناغ بەعەقڵانیتر دەبێت، ئەم بەعەقڵانی بوونەش لەوەدا بەرجەستە دەبێت کاتێك دادەبەزێتە نێو جیهانی سەیرورەت.

هیگڵ لێکۆڵینەوەیەکی تریشی ئەنجامداوە لەبارەی فەلسەفەی سروشتی، لەم لێکۆڵینەوەیەشدا ڕەخنەی ئەوە لەزانستی نوێ دەگرێت کەوای لەسروشت کردووە مۆرکی ناعەقڵانییانەی خۆی لەدەست بداتو گەردوونی





کردۆتە کۆمەڵێك هێزی مادییانە کەهیچ مۆرکێکی چۆنایەتییانەی نییە. جگە لەوەش هیگڵ دێت چەمکی کاتو شوێن شی دەکاتەوەو ئەم دوو چەمکەش وەکو دوو ڕووخسار نمایش دەکات بۆئەوەی ڕۆح لەخودی خۆیدا بچێتە دەرەوەو بەبزاڤی بالأبوونو بەزاندنی بەردەوامی دەبەستێتەوە، بەم شێوەیە باسەکانی ئەم ماوەیەی زیاتر جەخت دەکەنە سەر مۆرکی دەرخستنی ئاوێتەبوونی ناموتەناهی لەنێو موتەناهیدا(٣٤).

هیگڵ لەگەڵ ئەوەی لەم ماوەیەی ژیانیدا زیاتر بایەخی بەلێکۆڵینەوە لەفەلسەفەی سروشتیو فەلسەفەی ڕۆحی دەدا، بەلام توێژینەوەی لەبارەی فەلسەفەی ئەخلاقو فەلسەفەی سیاسیش ئەنجامدا، هەربۆیە دوو لێکۆڵینەوەی لەم بارەیەوە نووسیوە، یەکێکیان لەژێر ناوی (سیستەمی ئەخلاقی)و ئەویتریشیان بەناوی (باسێك لەبارەی مافی سروشتی)یەوە. لەباسی یەکەمیدا جەخت دەکاتە سەر چالاکی مرۆڤ بەگشتی، بۆیە قسە لەبارەی کارو ئامێرو خێزانو زمانو دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی مرۆڤ دەکات. لەباسی دووەمیشدا قسە لەبارەی دەوڵەت دەکات، هیگڵ پێی وایە هەموو دەوڵەتێك گوزارشت لەڕۆحی گەلێکی دیاریکراوو چارەنووسی ئەم گەلە دەکات.

لێرەدا نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت کە هیگڵ هەموو تیزو تیۆرە سیاسییەکانی خۆی لەبارەی دەوڵەتو یاساو مافەوە لەشۆڕشی فەرەنسی وەرگرتووە، بەلام دواتر خۆی لەئەنجامی پێشڤەچوونی ڕەوتی ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسییەوە گۆڕانکاریان بەسەردا دێنێت لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی مۆدێرندا، بۆیە شۆڕشی فەرەنسی سروش بەخشی هزری سیاسییانەی هیگڵ-ە. لەڕاستیدا زۆرجار هیگڵ بەوە تۆمەتبار دەکرێت کە پاڵپشتو تیۆریستی دەسەڵاتی سەرکوتکارو ستەمکارانەی دەوڵەتی بروسی بووە، چونکە پاڵپشتی مافە ڕەهاکانی دەوڵەتی کردووە لەبەرانبەر تاکدا، بەمانای ئەوەی تاك دەکاتە قوربانی دەوڵەت. ڕەنگە ئەو تۆمەتانە ڕاست یا ڕاستیش نەبن! چونکە هیگڵ لەو سەردەمەدا پێی وابووە دەوڵەتی بروسی





بەرجەستەکاری مێژووییانەی تیۆرەکەی خۆیەتی لەبارەی دەوڵەتەوە، تیۆری دەوڵەتێکی بەعەقڵانی کراو، واتا تا ئەو کاتە ئەوە باشترین شێوەی دەسەلاتو ڕێکخستنی دەوڵەت بووە. تێڕوانینی هیگڵ بۆ دەوڵەت ئەوەیە کە بوونەوەرێکی بایۆلۆژییە، لەدایك دەبێتو گەشە دەکاتو گەورە دەبێتو پیر دەبێت تاوەکو دەمرێت. جگە لەوەش لەلای هیگڵ دەوڵەت ئەوەندە پیرۆزە بەشێوەیەك هەموو هاولاتیان بەهاکانی خۆیان لەسایەی دەوڵەتەوە وەردەگرن. تیۆرو تێزی هیگڵ بۆ دەوڵەت ئەنجامی بیرۆکەی خۆیەتی لەبارەی مێژوو، بۆیە لەتیۆرەکەیدا دەوڵەت تەنیا بەشێكو لایەنێکی مێژوو نییە، بەڵکو جەوهەرو گیانی مێژووە، ناکرێت بەبێ ئەوەی باس لەدەوڵەت بکرێت باسی ڕووداوەکان بکرێت، لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتدا مێژوو دەست پێدەکات، ئەگینا هەموو ڕووداوەکانی تر دەکەونە دەرەوەی مێژوو( ٣٥).

هیگڵ کاتێك لەنێو کتێبی( فەلسەفەی ماف)دا پێناسەی دەوڵەت دەکات، دەنووسێت:" دەوڵەت بریتییە لەبوونی کردارەکییانەی بیرۆکەی ئەخلاقی، بریتییە لەرۆحی ئەخلاقی، چونکە ویستێکی جەوهەرییە لەخودی خۆیدا بەرجەستە دەبێتو بیردەکاتەوەو دەزانێتو دەردەکەوێت، بەو ڕادەیەی کە دەزانێت کارەکانی ئەنجام دەدات، دەوڵەت ڕاستەوخۆ لەنێو عورفو یاسادا بوونی هەیە، ناڕاستەوخۆش لەنێو وشیاری خودی تاكو مەعریفەو چالاکییەکانی، ئەوە لەکاتێکدا کە وشیاری خودی بەهۆی مەیلی بەرەو دەوڵەت، تێیدا ئازادی جەوهەری خۆی دەدۆزێتەوە، بەو سیفەتەی کە ماهییەتو مەبەستی چالاکییەکانییەتی(٣٦).

لەکۆتایی قۆناغی ژیانی لەشاری یێنا-دا، هیگڵ واز لەفەلسەفەی کردەیی دێنێتو ڕووەو کێشە میتافیزیکییەکان دەگەڕێتەوە، ئەو کێشانەی بەردەوام سەرقاڵیان کردبوو. کێشەی وەکو پێکهێنانی تێڕوانینو تیۆرێکی هەمەکیانە لەبارەی وجودەوە. شارەزایان لەژیانی هیگڵ ئەم قۆناغە ناودەنێن قۆناغی فەلسەفەی واقیعیو سالانی(١٨٠٥-١٨٠٦) دەگرێتەوە. لێرەدا هیگڵ دێت





بەشێوەیەکی مەزهەبییانە لەفەلسەفەی سروشتو فەلسەفەی رۆح دەکۆڵێتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك بۆئەو دابەشبوونە سێیانەیە بکات کەوا لە لۆژیك دەکات ببێتە بەشی یەکەم لەنێو بەشەکانی فەلسەفەدا. هیگڵ هەوڵیداوە ڕاڤەکردنێکی تیۆریانە بۆ واقیعی ئەزموونی عەینی بخاتە بەرچاو، بەلام زیاتریش بایەخی بەوەداوە ژیانی رۆحییانەی مرۆڤ ڕاڤە بکات، بۆیە دێت لەوشیاری یا نەست دەکۆڵێتەوە، گوایە وشیاری وێنەی بەراییانەی ژیانی رۆحە(٣٧).

لێرەدا دەبینین هیگڵ بایەخ بەلێکۆڵینەوە لەهێزە جۆراو جۆرەکانی وشیاری یا هەست دەداتو دێت لەهێزی یادەوەریو زمان دەکۆڵێتەوە کەلەلای ئەو هێزی یەکەمە، دواتریش لەئارەزوو دەکۆڵێتەوە کە هێزی دووەمەو پاشانیش لەرۆحی خێزانی یا ژیانی خێزانداری دەکۆڵێتەوە کەلای ئەو هێزی سێیەمە. کەواتە ئەوە بەدوایەکدا هاتنێکی پلەدارە لەژیانی تایبەتی خودیەوە تاوەکو بالاترین پلە کە بریتییە لەیەکێتی نێوان خودو بابەت. سەرەتا خود لەڕێگای هەستەکانەوە ڕووبەڕووی هەندێك حاڵەتی تایبەتی هەستی دەبێتەوە، کەچی دواتر لەڕێگای یادەوەرییەوە جۆرێك لەجێگیری بە بابەتەکە دەبەخشێت تاوەکو بیکات بەپێداویستیەکی هەمەکی. بەم شێوەیەش بەرزی دەکاتەوە سەر مۆرکی ڕاستەوخۆی هەستی پەتی. ئینجا زمان دێتو ناو بەسەر شتەکاندا دەسەپێنێتو جۆرێك لەیەکێتی لەنێو هەموو ئەو ناوە زۆرانە بونیاد دەنێتو جۆرێك لەتەباییو هاوشێوەیی لەنێوان هزرو خود بونیاد دەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەم قۆناغە هەست توانای ئەوەی نییە پێوەندیەکی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەویتر بونیاد بنێت. بەلام لەقۆناغی دووەمدا ئەوە ئارەزووەکە پاڵ بەخودەوە دەنێت تاوەکو لەخودی خۆی بێتە دەرەوەو ڕووەو ئەویتر هەنگاو بنێت، ئەوەش چونکە ئارەزوو بریتییە لەجۆرێك لەخەوائی ناوەکی کەپاڵ بەخودەوە دەنێت بەدوای تێربووندا بگەڕێت. لەکاتێکدا تێربوون ئارەزووی ئاژەڵیانەی مرۆڤ تێردەکات، بەلام ناتوانێت ئارەزووی مرۆڤایەتییانە لەناو ببات،

لەبەرئەوەی هەنگاونان بەرەو ئەویتر لەنێو قووڵایی ئەو پێوەندیەدایە کەلەگەڵ ئەویتردا کۆمان دەکاتەوە. هەرکاتێکیش ئارەزوو لەهەموو پێوەندییەکی چێژی سێکسیو چێژی جەستەیی ئازادبوو، ئەوە یەکێتی ئافرەتو پیاو دەگۆڕێت بۆ پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ کە بریتییە لەخۆشەویستی. لەتێڕوانینی هیگڵ هاوسەرێتی ڕاسترین گوزارشتە لەو یەکێتییە ڕاستەوخۆیەی کە دوو بوونەوەری تەبا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

لەقۆناغی سێیەمدا یەکێتی ژنو پیاو ئەوکاتە دەردەکەوێت کە ژیانی هاوبەشی خۆیان دەبەزێنن لەپێناوی بەرهەم هێنانی منداڵدا. منداڵ کە ئاوەژووکاری ڕاستەقینەی بەرووبوومی ئەو خۆشەویستییەیە کە لەنێو جیهانی دەرەکیدا بوونی هەیە. ئەوە منداڵە وا لەدایكو باوك دەكات خودی خۆیان وەکو دوو خودو ئەندامی بەشداربوو لەتوخمی ئادەمیزادی بەدی بکەن. منداڵ ئەو هەستە بەدایكو باوك دەبەخشێت کە ئەوان بەشدارن لەدرێژەدان بەڕێڕەوی ڕەگەزی مرۆڤایەتی، بۆیە لێرەدا بایەخی هەریەك لەدایكو باوك وەکو خودێك لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا دەردەکەوێت. ئەوەش باڵاتر کردنی خودی ئەوانە وەکو خودێك. لەگەڵ ئەوەشدا کە منداڵ بەرهەمی پێوەندی نێوان ژنو پیاوە، بەڵام بۆخۆی هەستێکی تەواو سەربەخۆیە لەنێو جیهاندا، منداڵ هەربەتەنیا ئاوەژووکاری یەکێتیو تەبایی نێوان ژنو پیاو نییە، بەڵکو جگە لەوە، ئەو بوونێکی تەواو سەربەخۆی هەیە لەئاست ئەواندا، کاتێکیش ئەوان بایەخی پێدەدەنو پەروەردەی دەکەن، ئەوە زیاتر ئەم سەربەخۆییەی منداڵ گەشە پێدەدەنو مۆرکێکی جێگیرترو ڕاستەقینەتر لەخۆیەوە دەگرێت، ئەوکاتەش ژیانی خێزانداری لەنێو باوەشی ئەو کۆمەڵگا بچووکەوە گەشەدەکات کەلەسەر کۆمەڵێك پێوەندی دژکاریو تەباییو کۆمەڵێك دوالیزم بونیادنراوە، دوالیزمی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، ململانێو خۆشەویستی....تاد.

ئەلێرەدا منداڵ لەئاست دایكو باوكدا یەکێکی تری ڕەهایە، ئەویترە. زۆرجاریش ئەوان هەوڵدەدەن خۆیان بەسەر ئەو خودە دابسەپێنن، بەڵام





بێسودە، چونکە دواتر لەوەتێدەگەن کە بوونی ئەوان وەکو خودێك لەوەدایە کەدان بەبوونی ئەویترەوە بنێن. ئەویتر کەبەرهەمی خۆشەویستیو یەکێتی خودی ئەوانە، بۆیە ژیانی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەرایی بونیاد نانرێت تەنیا ئەوکاتە نەبێت کەدان بەئەویترەوە دەنێن، تەنیا بەم ڕێگایە دەتوانن بەپرۆسەی باڵابووندا تێپەڕن. بزاڤی باڵابوونو بەزاندنی خود بەشێوەیەك لەشێوەکان دەوڵەمەندکردنی خودو قووڵکردنەوەی ژیانی ڕۆحییە، ئەوە باشترین گوزارشتە لەپێوەندی نێوان خودو خوددا، لەلایەکی تریشەوە هەستکردنە بەخود وەکو ئەوەی کە ڕۆحە(٣٨).

بەر لە ئەوکاتە، واتا لەساڵی(١٨٠١)دا، هیگڵ وەکو مامۆستای بێ مووچە لەزانکۆی یێنا دامەزرابوو، دواتر وەکو قوتابییەکی بلیمەتی شلینگ ناوی دەرکردو وەکو مامۆستایەك لەدەرەوەداو لەبەرانبەر پاداشتێکی کەم، لەساڵی(١٨٠٥)دا هەر لەزانکۆی یێنا دامەزرا، بەڵام هیگڵ هەر لەساڵی(١٨٠٣ )وە دەستیکرد بووە خاوەنی مەزهەبێکی تایبەت بەخۆی، ئەوەش زۆر بەڕوونی لەو وانەبێژیيانەدا دەرکەوت کەلەساڵی خوێندنی(١٨٠٥-١٨٠٦)دا بۆقوتابیانی زانکۆی یێنای دەگوتەوە. لەم وانە بێژییانەدا هیگڵ باسی لەزۆر بابەت کرد، وەکو ڕۆحی خودیو ڕۆحی بابەتیو تیۆری هزر-بیرۆکەو دابەزینی هزر بەردەوام بەرەو خوارەوە بۆسروشتو بابەتی گواستنەوە لە وجود لەخودی خۆیەوە بۆ وجود بۆ خودی خۆیو شیکردنەوەی هەردوو چەمکی عەقڵ و ویستو توێژینەوەی ورد لەرۆحی بابەتی وەکو دەرکەوتەیەکی نێو ژیانی مەدەنیو سیاسی، جگە لەوانەش دێت لەجۆرەکانی حکومەتو سیستەمی سیاسی دەکۆڵێتەوەو جۆرەکانی دەستووری دەوڵەت شی دەکاتەوەو بەویستی هەمەکیو ویستی عەقڵیان دەبەستێتەوەو قسە لەبارەی چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکانیش دەکاتو .....تاد کە دواتر زۆر بەقووڵی لێیان دەکۆڵێتەوەو چەندین کتێبی گرنگو نایابیان لەبارەیەوە دەنووسێت. لەدواییشدا دەبینین هیگڵ قسە لەبارەی هونەرو ئایینو فەلسەفە دەکات تاوەکو پەیامی هەریەك لەم کایانە

ڕوون بکاتەوە لەنێو ژیانی ڕۆحدا، بۆیە لەم ساتانەدا بۆیەکەمجار لەنێو پێشقەچوونی ڕۆحیانەی هیگڵ-دا دەبینین بەیەکەوەو لەپاڵ یەکەوە قسە لەسەر ئەم سێ شێوەیەی چالاکی مرۆڤ دەکاتو ئاماژە بەگرنگیان دەدات لەسەر بەزاندنی دژکاری نێوان خودو بابەتدا.

لەنێوەی ساڵی خوێندنی(١٨٠٥-١٨٠٦)دا هیگڵ بەقوتابییەکانی خۆی ڕاگەیاند:( خۆری سەردەمێکی تازە بەسەر جیهاندا پرشنگ دەداتەوە... وادیارە کە لەکۆتاییدا ڕۆحی جیهان سەرکەوتوو بوو لەوەی درك بەخودی خۆی بکات وەکو ئەوەی کە ڕۆحێکی ڕەهایە.... وشیاری موتەناهی وازی لەوەهێنا کە چیتر لەسەر حاڵەتی خۆی بمێنێتەوە، بۆیە هەر بەتەنیا هەستێکی موتەناهی نییە بەخود. لەلایەکی تریشەوە وشیاری ڕەهاش توانی ئەو وجودە واقیعییە بەدەست بێنێت کە نەیبوو)(٣٩). مەبەستی هیگڵ لەم ڕاگەیاندنەیدا تەنیا ئەوەبوو بە قوتابیەکانی خۆی ڕابگەیەنێت کەرۆحی ڕەها توانیویەتی لەسەر دەستی هیگڵ-ەوە هەست بەخودی خۆی بکات، وەکو ئەوەی هیگڵ بووبێتە قسەکەری ڕەسمیو ڕەهای ناموتەناهی یا ڕەها. هیگڵ بەرلەوکاتە، چەند ساڵێك بوو سەقاڵی نووسینەوەی چیرۆکی ئەم ڕۆحە ڕەهایە بوو، ئەوەبوو لەساڵی(١٨٠٦)دا، لەو ساڵەی شەڕە گەورەکەی یێنا ڕوویدا، هات مەزنترین کاری فەلسەفی خۆی خستەڕوو، ئەویش کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح) بوو کە لەسەرەتاکانی ساڵی(١٨٠٧)دا چاپکرا. هیگڵ ئەم کارەی لەبارودۆخێکی سەختو دژواردا تەواوکردو نووسی، چونکە بلاوکەرەوەکەی زۆر پەلەی لێدەکرد. ئەو کاتەی دەستی بەنووسینی ئەم کارەی کرد، بۆ خۆیشی نەیدەزانی کۆتاییەکەی چۆن دەبێت، بەلاّم بێگومان ساڵێك بوو لەنەخشەی سەرەتاییو سیستەمی کارەکەی ڕادەما، لەکۆتاییشدا کورتەی سەرجەم هزرەکەی خۆی بەناوی(فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح) بلاوکردەوە(٤٠). مەبەستی هیگڵ لەم توێژینەوە فینۆمینۆلۆژییە دوورو درێژەیدا ئەوەبوو بەشوێن پێی پێشقەچوونی وشیاریدا بڕواتو هێدی هێدی هەر لەسەرەتای یەکەم دژکارییەوە دەست پێبکات لەنێوان وشیاریو





بابەتدا تادەگاتە قۆناغی مەعریفەی ڕەها کە کۆتایی ئەم قۆناغە فەلسەفییە مەزنەیە. لەگەڵ ئەوەی هیگڵ مەبەستی بوو ئەم کتێبە مەزنەی خۆی بکاتە دەسپێکی دەروازەی چوونە نێو مەزهەبی بیرکردنەوەی فەلسەفییانەی خۆی، بەلاّم لەنێویدا گرنگترین ڕەگەزو بیرۆکە فەلسەفییە مەزنەکان بەدی دەکەین کە خودی مەزهەبی فەلسەفی خۆی لەسەر بونیادنراوە.

لەواقیعدا هیگڵ ویستوویەتی لەم کتێبەدا وێنەیەکی گشتی ئەو ڕێڕەوەمان بۆ بکێشێت کە دەروون-نەفس گرتوویەتیە بەرو بە وشیاریدا تێپەڕیوە تاوەکو بووەتە ڕۆح. کەواتە ئەم کتێبە چیرۆکی پێکهاتنی ڕۆحە، یا ڕۆمانێکە کولتووری فەلسەفە دەگێڕێتەوە، چونکە شوێن پێ هەڵگرتنی وشیاریو دەسبەرداربوونی لەبیروبۆچوونە سەرەتاییو بەراییەکانی خۆیو وەرگرتنی ئەزموونی بەردەوام بۆ گەیشتن بەتێڕوانینێکی فەلسەفییانەی دروستە بۆگەیشتن بەمەعریفەی ڕەها. هیگڵ خۆیشی لەچاپی دووەمی ئەم کتێبەدا پێشەکییەك دەنووسێتو ئاماژە بۆئەوە دەکات کە ئەو دەستی وشیاری سروشتی گرتووە تاوەکو هێدی هێدی ڕووەو مەعریفەی فەلسەفی ببات. فینۆمینۆلۆژیا لەبنەڕەتدا هەڵمەتێکە بۆسەر هەموو خولیایەکی ڕێژەگەراییانە لەنێو مەعریفەدا، ئارەزوویێکە بۆبەرزکردنەوەی فەلسەفە بۆ ئاستی زانست. یا بەشێوەیەکی تر شۆڕشێکە بەسەر هەموو خولیا ڕۆمانتیکیەکانی نێو فەلسەفەدا. هیگڵ لەزیاد لەشوێنێکیشدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو مەبەستی بووە مەعریفەی ئەزموونی بکات بەمەعریفەی فەلسەفی، لەیەقینی هەستییەوە بمانبات بۆ مەعریفەی ڕەها(٤١).

کتێبی فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح خاڵی وەچەرخانی گرنگی پێشقەچوونی هیگڵ بووە، چونکە لێرەدا لەگەڵ ئەم کتێبەدا دەرکەوت کە هەڵوێستو تێڕوانینی فەلسەفییانەی هیگڵ زۆر لەهەڵوێستو تێڕوانینی کانت و فیختەو شلینگ جیاوازە. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەهزرڤانان پێیان وایە





هەندێك کەمو کوڕی لەنێو فینۆمینۆلۆژیادا هەیە، بۆ نموونە هیگڵ زۆر بەڕوونی ئاماژە بۆ رۆح ناکات، ئەو رۆحەی هیگڵ لێی دەکۆڵێتەوە، رۆحی کێیە؟ ڕاستە زۆرجار واهەست دەکەین کە ئەوە رۆحی سەرتاپای مرۆڤایەتییە، وەکو ئەوەی دیارە هیگڵ لەبارەی پەروەردەی مرۆڤایەتی دەنووسێت، کەچی لەهەندێك کاتی تردا رۆح وا دەردەکەوێت کە هاوشان و موورادیفی چەمکی خوا بێت!(٤٢). لەڕاستیدا ئاڵۆزییەك هەیە لەبەکارهێنانی چەمکی رۆح یا عەقڵ، چونکە زۆربەی وەرگێڕو تەنانەت نووسەرە عەرەبی و جیهانییەکانیش سەریان لێدەشێوێت، بەو مانایەی چەمکی(جایست-Geist) لەنێو زمانی ئەڵمانیدا بەمانای رۆح دێت، بەڵام بەمانای دیکەش بەکارهێنراوە وەکو( عەقڵ، زەین، خەیاڵ، هزر، ماهییەت، تارمایی، دەروون، رۆحی پیرۆز، نیاز، .....تاد). جۆن کۆتنگهام لەبارەی چەمکی گایست دەنووسێت:" دەکرێت بیرۆکەی گایست لەلای هیگڵ کەمێك ماقووڵ ڕاڤە بکەین، چونکە سەرەڕای ئەو بانگەشە کردنە دوورو درێژانەی کە هەندێکجار خەیکە سۆفییانە خۆیان دەردەخەن و هیگڵ بەم رۆحە ڕەهایەی دەبەخشێت کە خۆی گریمانی بوونی خودی خۆی دەکات، دەگەینە ئەوەی کە تێڕوانینی فەلسەفەی هیگڵ‌ی تێڕوانینی حەقیقەتە پێشینەییە نازەمەنی و حەقیقەتە نەمرەکان نییە، هیگڵ بەر لەهەموو شتێك هەوڵدەدات کردەی دینامیکی و کردارەکییانەی مێژوویی جیهان بدۆزێتەوەو ڕاڤەی بکات. ئەگەر ئێمەش بەم شێوەیە بڕوانینە گایست، ئەوە گایست دەبێتە ڕەهاییەکی رۆحی ئاڵۆزو نادیارو تەموو مژاوی کە هەموو شتێك بەشداری تێدا دەکات، وەکو قۆناغی کۆتایی لەپێشڤەچووندا کە مێژوو ڕووەو ئەو هەنگاو دەنێت. گایست وەکو ئەوەی هیگڵ جەختی لەسەر دەکاتەوە لەسەر سێ شێوە دەردەکەوێت، ئەویش هونەرو ئایین و فەلسەفەیە"(٤٣). پێشەکی ئەم کتێبە کە هیگڵ خۆی نووسیویەتی دوای نزیکەی سەدەو نیوێك زیاتر هێشتا هەر قسەو باسی زۆری لەسەر کراوە، ئەوەتا هیپۆلێت وتارێکی تایبەتی خۆی بۆ خوێندنەوەو شرۆڤەکردنی





پێشەکی ئەم کتێبە تەرخان کردووە، هیپۆلێت دەنووسێت:" دوای ئەوەی هیگڵ لەفینۆمینۆلۆژیا بۆوەو بەپێی ئەو کارەی ئەنجامی دابوو لەو پرۆسە فەلسەفییەی خۆی ڕاماو پێشەکییەکەی بەشێوەیەکی وا نووسی کە جیاوازە لەنمایشە ئەسڵییەکە. ئالێرەدا ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئەو چۆن مەزندەی داهاتوو ئایندەی گوتاری فەلسەفی دەکات. ئەوەش نمایشکردنێکی سەیر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەرلەهەموو شتێکدا دەڵێت:( وتەکانی من لەسایەی-پێشەکی-یەکەوە بەجیدی وەرمەگرن، چونکە کاری ڕاستەقینەی فەلسەفی ئەو شتەیە کە تازە نووسیومە-فینۆمینۆلۆژیا-ئەگەر لەدەرەوەی ئەو شتەی کە نووسیومە قسەت لەگەڵدا بکەم، ئەوە ئەم وتە پەراوێزانە ناشێت بەهای خودی کارەکەیان هەبێت، لەوەش زیاتر ئەوەیە کە من کارێکی تری زۆر جیاواز دەنووسم، ئەم کارەش لۆژیکێکی تێڕامانکارییانەیە). بەم شێوەیە-پێشەکی- دەکەوێتە نێوان دوو کاری سەرەکی هیگڵ"(٤٤). هیگڵ مەبەستی بوو دوای بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبەی، ببێتە مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی یێنا، بەڵام لەم کاتانەدا ئەوەندە هزرڤان و فەلسەکار چاویان بڕیبووە ئەم کورسییە، بەشێوەیەك هیگڵ پاشەکشەی لەئارەزووەکەی خۆی کردوو بەیەکجاری وازی لەزانکۆ هێناو بوو بەسەرنووسەری یەکێك لەڕۆژنامەکانی ئەوکاتە کە ناوی (گازێتا دی بابێرگ) بوو، لەئاداری(١٨٠٧)دا تاوەکو تشرینی دووەمی ساڵی(١٨٠٨) بەسەرنووسەری ئەم رۆژنامەیە مایەوە. ئەو کاتانە بروسیا لەژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی فەرەنسیدا بوو، چونکە سوپاکەی ناپلیۆن بەشی هەرە زۆری، بگرە سەرتاپای ئەڵمانیای داگیر کردبوو، بۆیە هیگڵ هاوکاری فەرەنسییەکانی کرد، جگە لەوەش ئەوخۆی زۆر بەکەسایەتی نابلیۆن سەرسام بوو، بۆیە دەیگووت:( ناپلیۆن دەروونی جیهانە)-لەهەندێك نووسیندا ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کە گوتوویەتی(ناپلیۆن رۆحی جیهانە).

لەساڵی(١٨٠٧)دا کوڕێکی ناشەرعییانەی بوو کە ئەنجامی پێوەندییەکی ناشەرعییانەی بوو لەگەڵ خانمێکدا، ئەم کوڕەی ناونا لۆدڤیگ(٤٥).

لەدایکبوونی ئەم کوڕە لەم کاتانەدا هیگڵ ی زۆر هەراسانکرد. لەلایەك باری ئابووری باش نەبوو، لەلایەکی تریش ئەو تازە دەستی دەکرد نووسین و لێکۆڵینەوە مەزنەکانی خۆی دەنووسی، بۆیە هەندێك کات ئەم مەسەلەیە نیگەرانی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دانی بەم کوڕەی خۆیەوە ناو وەکو منداڵێکی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد. لەساڵی(١٨٠٨)دا لەڕێگای هاوڕێیەکی بەناوی نیشامیر کەسەرپەرشتیاری گشتی فێرکردن بوو لەباڤاریا، کرایە بەڕێوەبەری پەیمانگای نۆرمبێرگ و تاوەکو ساڵی(١٨١٦) لەم پۆستەدا مایەوەو سەرقاڵی گووتنەوەی وانەی کولتووری گریکی و لاتینی بوو، هەروەها وانەی (دەروازەی فەلسەفە)ی بۆقوتابیانی قۆناغە کۆتاییەکان دەگووتەوەو زۆر هەوڵیدەدا تاوەکو فەلسەفەو بۆچوونەکانی خۆی لەگەڵ ئاستی خوێندنی ئامادەییدا بگونجێنێت. لەساڵی (١٨٠٩)دا کتێبێك لەژێر ناوی(دەروازەیەك بۆ فەلسەفە) دەنووسێت، ئەم کتێبە بەناوی(پرۆپیدیتیك ناسراوە(٤٦).

هیگڵ کاتێك بیری لەزەواج کردەوە، لە(١٦)ی ئەیلولی ساڵی(١٨١١)دا خوازبێنی خاتوو ماریا فۆن تۆڤەری کرد، ماریا فۆن کچی خێزانێکی پایە بەرزی کەم دەرامەت بوو، لەوکاتەدا هیگڵ تەمەنی گەیشتبووە (٤١) ساڵ، کەچی خاتوو ماریا فۆن هێشتا (٢٠) ساڵی تێپەڕ نەکردبوو. هیگڵ لەماریا فۆن دوو منداڵی بوو، یەکەمیان کارڵ کەدواتر دەبێتە مامۆستای مێژوو، ئەویتریشیان ئیمانوێڵ کەدەچێتە نێو خوێندنی لاهوتی برۆتستانتی و دەبێتە پیاوێکی ئایینی. بەم شێوەیە هیگڵ دەبێتە خاوەنی سێ کوڕ.

لەماوەی نیشتەجێبوونی لەنۆرمبێرگ-دا، هیگڵ دەست دەکات بەنووسینی کتێبێکی تری مەزنی خۆی ئەویش (لۆژیکزانی)یە کەسێ بەشەو لەماوەی نێوان ساڵانی(١٨١٢-١٨١٦)دا تەواوی دەکات، دیارە ئەم کتێبەش بەردی بناغەی مەزهەبەکەی خۆیەتی و کارێکی هەرە دەگمەنی هیگڵ-ە. ئێمە ئەوەمانزانی کە هیگڵ لەنێو کتێبی فینۆمینۆلۆژیای رۆح-دا ویستی وشیاری لەیەقینی هەستییەوە بگوازێتەوە ئاستێکی بالآتر بەرەو مەعریفەی فەلسەفی یا





زانستی ڕەهای ببات، لەم کارەشدا پشتی بەجۆرێك لەبالآبوونی عەقڵی بەستبوو. کەچی دەبینین خاڵی دەسپێکی نێو کتێبی (لۆژیکزانی) دانپێدانانە بەهاوشێوەیی و تەبایی هزر لەگەڵ واقیعدا بەشێوەیەك ئەم واقیعە وێنەی نمایشکراوی هزرە، واتا هزر لەسایەی واقیعەوە خودی خۆی بەدی دەکات. لەنێو (لۆژیکزانی)دا هزر لەبابەتەوە دەست پێناکات گوایە حەقیقەتێکی دەرەکییەو بوونی تایبەتی و سەربەخۆی خۆی هەیە، بۆئەوەی دواتر ئەم بابەتە بکات بەچرکەساتێك لەچرکەساتەکانی خود لەنێو چالاکی عەقڵیدا، بەڵکو لەوەدەست پێدەکات کە خودی خۆی عاقڵ بکات تاوەکو لەوە دڵنیابێت کە لەم ڕێگایەوە دەتوانێت جیهانی بابەتەکان ئافرێدە بکات. دواتریش ئەوە بەدی دەکەین کەچۆن هیگڵ سەرجەم لۆژیکەکەی خۆی لەسەر شوناسی هزرو بوون بونیادناوەو جەخت دەکاتە سەر ماقووڵیەتی واقیع. خودی ئەم مەسەلەیەش دواتر لەبەشی داهاتوودا بەدرێژی دەخەینەوە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

ئەم کتێبە بووە هۆی ئەوەی زیاتر هیگڵ لەنێوەندی ئەکادیمیدا بناسرێت و ڕێزی زیاتری لێبگیرێت، بۆیە هیگڵ خۆی بۆئەوە خۆشکردەوە ببێتە مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی بەرلین، دوای ئەوەی فیختە لەساڵی( ١٨١٤)دا کۆچی دوایکردبوو، ئەم پۆستە بە بەتاڵی مابۆوەو کەسێك جێگاکەی نەگرتبۆوە. جگە لەوەش هیگڵ دوای ڕووخانی دەسەڵاتی نابلیۆن باروگوزەرانی لەنۆرمبێرگ خراپ ببوو، چونکە لەباڤاریا کاتۆلیکەکان دوای ڕووخانی ناپلیۆن کەوتنە دژایەتیکردنی ئەوکەسانەی پاڵپشتیان لەناپلیۆن کردبوو یا کاریان لەگەڵ دەسەڵاتی فەرەنسی کردبوو. ئەمجارەشیان مەسەلەکە سەری نەگرت و ئاواتەکەی هیگڵ نەهاتە دی و نەکرایە مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی بەرلین. بەناچاری لەساڵی(١٩١٦) بەوە ڕازی بوو ببێتە مامۆستای فەلسەفە لەزانکۆی هایدلبێرگ. دووساڵ لەم پۆستەدا مایەوەو لەم ماوەیەشدا کارێکی تری مەزنی تەواوکرد، ئەویش (ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان) بوو کەچاپی یەکەمی لەساڵی(١٨١٧)دا بلآوکرایەوە.

هـیگڵ لـەم کتێـبەدا زۆر بـەوردی ئایدیالـیزمی دیالیکتـیکی ڕەهـا نمـایش دەکـاتو بەشـێوەیەکی زۆر ئەپسـتراکتانەش بۆچـوونە ئایینـیـیەکانی خـۆی دەخاتـە ڕوو، وەکـو ئـەوەی مەبەسـتی سـەرەکی هـیگڵ ئەوەبێـت ڕۆح وەکـو حەقیقەتـێکی بـالاّ پیشان بدات. لەڕاستیدا تاکە شت کە لۆژیكو فەلسەفەی سروشـتو فەلسـەفەی ڕۆح بەیەکـەوە کۆدەکاتـەوە (لۆگـۆس)ە کـە لەنـێو هـەموو شـتێکدا هەیـەو سـەرتاپای بوون واپیشاندەدات وەکو ئەوەی ژیانێکی تۆتالیـتاری لۆژیکی بێـت. کتێبی ئینسکلۆپیدیا هەموو مەزهەبەکەی هیگڵ لەخۆیــەوە دەگرێــت، بــەلاّم بەشــێوەیەکی پلانئامــێزانەو نەخشــە بــۆ کێشراوانە. لەبەشی یەکـەمی ئـەم کتێـبەیدا، هـیگڵ بیرۆکەیـەکی گشـتیمان پـێدەدات لـەبارەی فەلسـەفەو مەعریفەی فەلسەفییەوە، تایبەتمەندییەکانی مەعـریفەی فەلسـەفیو ئـەو شـتانەی مەعـریفەی فەلسـەفی لەمەعـریفەی ڕەمـەکی جـیا دەکەنـەوەو خـاڵی لێکچـوونو هاوبـەشو خـاڵی جـیاوازیو نـاکۆکی لەگـەڵ زانسـتەکانی تـردا(٤٧)، ئـێمەش هـەموو ئەوانـەمان لەبەشـی دووەمـی ئـەم کتێـبەدا خسـتۆتە ڕوو. لەبەشـی دووەمـدا دێـت بیرۆکەیـەکی سەرەتاییمان لەبارەی پێناسەکردنی لۆژیكو بابەتەکانیو ئەو پێشڤەچوونە تازەیـەی ئـەم زانسـتە دەخاتـە بەردەست. لەکۆتایی ئەم بەشەدا هیگڵ دێت چـیرۆکی کەوتـنە خـوارەوەی مـرۆڤ لەبەهەشـت شـی دەکاتـەوە. لەبەشـی سـێیەمدا هەڵوێستی میتافیزیکامان بـۆ ڕاڤـە دەکـاتو پێی وایە میتافیزیکا لەگـەڵ کریسـتیان فۆڵفو قوتابخانەکـەیدا گەیشتۆتە لووتکەی خۆی، لەگەڵ ئەوەشـدا هـیگڵ ڕەخـنە ئاراسـتەی ئـەم میتافـیزیکایە دەکـات، گوایـە ئـەم میتافـیزیکایە خـاوەنی شـێوە بیرکـردنەوەیەکی بابـەتی نـەبووەو ئـازادیش نـەبووە. دواتـر دێـت ئـەو میتافـیزیکا کۆنـە دەکاتـە چوار بەشی سـەرەکی: ئەنــتۆلۆژیا، کۆسمۆلۆژیــا، ســایکۆلۆژیا، لاهوتــی سروشــتی(٤٨). لەبەشــی چوارەمدا هـیگڵ وتوویـێژ لـەبارەی هەڵوێستی دووەمـی هـزر دەکات لەئاست بابەتگەرایـیدا وەکـو ئـەوەی لەهـەردوو مەزهـەبی گەورەی ئەزموونگەراییو کانـت‌یـدا دەردەکەوێتو دێـت لایەنـە سـەرەکییەکانی فەلسەفەی ڕەخنەیی





شــی دەکاتــەوە، عــەقڵی ئەپســتراکت لــەلای کانــت، عــەقڵی کــردارەکی، ڕەخـنەگرتن لەبـڕیاردان لای کانـت. لەبەشـی پێنجەمیشـدا هـیگڵ دێـت هەڵوێستی سێیەمی هزرمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لەئاست بابەتگەراییدا وەکو ئـەوەی لەنـێو مەعـریفەی حەدسی یا ڕاستەوخۆدا هەیە. لەبەشی شەشەمدا هـیگڵ دێـت چـەند پێناسـەو دابەشکردنێکی تر بۆ لۆژیك پێشکەش دەکاتو سـێ لایـەنی لۆژیـك دەخاتـە ڕوو: لایـەنی ئەپستراکت، لایەنی دیالیکتیکی یا لایەنی نێگەتیڤی عەقڵ، لایەنی تیۆری یا لایەنی پۆزەتیڤی عەقڵ(٤٩).

بلاّوبوونەوەی کتێبی ئینسکلۆپیدیا، هیگڵ‌ی وەکو فەلسەفەکارێکی گەورە ناساندو کۆمەڵێك لەقوتابیانی لەدەورەی کۆبوونەوەو ئەڵقەیەکی بچووکیان پێکهێنا تاوەکو لەبۆچوونو تیۆرەکانی بکۆڵنەوە، هەروەها بووە هۆی ئەوەی لـەناوەوەو لـەدەرەوەی ئەڵمانـیادا، ئاشـنایەتی لەگـەڵ نـاوەندی ئـەکادیمیو هـزری پـەیدا بکـات، ئەوەبوو هزرڤانی فەرەنسی فیکتۆر کۆزان زۆر پێیەوە سەرسـام بـوو لەسـاڵی(١٨١٧)دا لەفەرەنساوە چووە ئەلمانـیا بۆئـەوەی هـیگڵ ببینێـت، ئەوکاتـەش کـۆزان مامۆسـتابوو لـەزانکۆی سـۆربۆنو بـەهاوکاری یەکـێك لەقوتابیـیە ئەڵمانیـیەکانی هەوڵـیدا لەئینسـکلۆپیدیا کـەی هـیگڵ بکۆڵێـتەوە، ئەگەرچـی دواتـر کـۆزان دانـی بـەوەدانا کـە هەوڵو کۆششەکانی بۆتێگەیشتن لەهیگڵ بەفیڕۆچووە.

لـەکانوونی دووەمــی ســاڵی(١٨١٧)دا وەزیــری پــەروەردەو خوێــندن داوای لەهـیگڵ کرد قبووڵی ئەوە بکات بچێتە بەرلینو ببێتە مامۆستای فەلسەفە. بـەم جـۆرە خەونـە هـەرە گەورەکـەی هـیگڵ هاتـەدیو لەتشرینی یەکـەمی ساڵی(١٨١٨)دا دەسـتی بەوانـە گوتـنەوە کـرد. لەیەکـەم وانەبـێژیدا لەبەردەم قوتابـیانی بەشـی فەلسـەفەی زانکـۆی بـەرلین‌دا هـیگڵ گوتـی:( ئازایـەتی لەحـەق و بڕواهێـنان بـەتوانای عەقڵ، دوو مەرجی سەرەکین بۆهاتنە ئارای فەلسـەفەو سـەرهەڵدانی. مـادام مـرۆڤ لەجەوهـەردا ڕۆح یـا عەقڵـە، ئـەوە لەتوانایدایـە، بگـرە مافی ئەوەی هەیە خۆی وا دابنێت کەشایستەی بالاّترین شـتی نێو بوونە، بەلاّم مرۆڤ هەرچییەك بکات، ناتوانێت بیرۆکەیەکی ڕاست





لای خـۆی لـەبارەی توانـاو مەزنێـتی عـەقڵی خـۆی گەلاڵـە بکـات. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەگـەر بـڕوای بەوەکـرد کـە عەقڵێکی بـاڵای هەیـە، هـیچ شـتێك ناتوانێت بەر بەم بڕوایە بگرێت)(٥٠). ئیتر لەم ڕۆژە بەدواوە تاوەکو لە (١٤ )ی تشـرینی دووەمـی(١٨٣١)دا مـرد، هـەر سـەرقاڵی وانـە گووتـنەوە بـوو لـەزانکۆی بـەرلین. دەبێـت ئـەوەش لـەیاد نەکـەین کـە بەچەند مانگێك بەر لەمردنی، هەواڵی خنکانی لۆدڤیگ-ی پێدەگات کە لەدەریادا ژێر ئاو دەبێت. لـەم ماوەیـەدا وانەبـێژی لـەبارەی مـێژووی فەلسـەفەو فەلسـەفەی ئـایین‌و فەلسەفەی مێژوو و ئیستاتیکا دەگوتەوە، هەروەها سەرپەرشتی زۆر لیژنەی وتوێـژی زانسـتی‌و کـاری تاقیکردنەوەکانی دەکـرد. هـیگڵ دوای ئـەوەی پێی خـۆی لـەم زانکۆیـەدا قـایم کـرد، چـەندین گۆڕانکـاری و چاکسازی بەسـەر میـتۆدو پرۆگـرامی خوێـندندا هێـناو هـەندێك وانـەی نوێـی گوتـەوە کـە بەرلەئەو لەم زانکۆیەدا کەسێك نەیدەگوتەوە.

دوا کـاری هـەرە گـەورەی هیگڵ، کتێبی (فەلسەفەی ماف) بوو کە لەساڵی( ١٨٢١)دا بلاَوکرایەوە. لـەم کتێـبەدا زیاتـر بایـەخ بەچالاکی سیاسییانەی تاك دەدات، مـادام دەوڵـەت ڕوخساری بەرجەستەکراوی بەدیهێنانی هەمەکییەتی بەرجەسـتەکراوە لەنـێو واقیعدا، ئەوە بۆیە هیگڵ لەم بیرۆکە ئەفلاتوونییە نـزیك دەبێـتەوە کە دەڵێت دەبێت فەلسەفەکار سەرکردایەتی شار بکات، لای هـیگڵ ئـەم بیرۆکەیـە بۆئەوەیە تاوەکو گونجان و ئاوێتەبوون لەنێوان ڕۆح‌و واقـیعدا بێـتەدی. لەنـێو (فەلسـەفەی مـاف)دا، هـیگڵ جەخـت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە نابێـت تـاك لەنـێو کۆمـەڵگادا هـەروەکو تاکـێکی ئاسـایی ژیـان بەسـەر ببات، بەڵکو دەبێت ئەندامێکی کارابێت لەنێو هەمەکییەتی گشتیدا. لــێرەدا دیــارە بۆچــوونەکەی هــیگل کــار لەپێــناو بــەلاوەنانی خولــیای تاکگەرایانـەی ڕۆمانسییەکان‌و خولیای تاکگەرایانەی عەقڵی دەکات(٥١). لەم کتێـبەدا هـیگل بـاس لەکێشـەی ئـازادی‌و پـێوەندی بەپێداویسـتی دەکـات، هـەروەها قسـە لـەبارەی یاسـاو ئـەخلاق و خـێزان‌و کۆمـەڵگای مـەدەنی‌و دەوڵەتیش دەکات، لەکۆی هەموو ئەوباسانەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە







کـە دەوڵـەت بەرجەسـتە بوونـێکی ڕاسـتەقینەو کارایانـەی ئایدیـای بـاڵای ئەخلاقیـیەو تاکـە فرمانیشـی ئەوەیە یارمەتی مرۆڤ بدات لەدەست حاڵەتی نـامۆبوونی خـودی دەربـازی بکـات، ئـەو نامۆبوونـەی مـرۆڤ کەوتۆتە داوی‌و سانا نییە لێی دەرباز بێت.

دوای مـردنی، لایەنگـرانی هـیگڵ هـەر زوو بـەزوو دابەش بوونە سەر دوو لایـەن‌و دوو ڕەوت، ڕەوتێکی ڕاستڕەو کە تائەوپەڕ ئیستیغلالی لاهوتی هیگڵ-یـان کـردو هەوڵـیاندا ژیانـێکی نوێ بخەنەوە بەر پرۆتستانتییەت. ڕەوتێکی چەپڕەو کـە بـەناوی هیگڵ-ییە لاوەکان ناسراون‌و ڕۆحێکی شۆڕشگێڕانەیان هەبوو. ناودارترین ئەمانەش فیۆرباخ‌و مارکس بوون(٥٢).

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی یەکەم


١) بونیادی زمانی فەلسەفیلەلای هیگڵ، جان هیپۆلێت، وەرگێڕانی-ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، کاروان(١٧٢).

٢) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص٥.

٣) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٣٤.

٤) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص٦.

٥) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٣٥.

٦) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٣٧.

٧) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص٥٢.

٨) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٣٩.

٩) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٠.

١٠) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص٥٨.

١١) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٣.

١٢) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٣.

١٣) حیاة یسوع، هیجل، ترجمة-جرجي زیدان، لبنان، ١٩٨٤، ص٣٤.

١٤) حیاة یسوع، هیجل، ترجمة-جرجي زیدان، لبنان، ١٩٨٤، ص٣٨.

١٥) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٣.

١٦) الموسوعة الفلسفیة المختصرة، ترجمة-فواد کامل، جلال العشری، عبدالرشید الصادق، بغداد، ١٩٨١، ص٩٥.

١٧) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٤.

١٨) المنهج الجدلي عند هیجل، د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨١، ص٩٥.

١٩) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٩.

٢٠) المنهج الجدلي عند هیجل، د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨١، ص٤١.

٢١) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٤٩.

٢٢) المنهج الجدلي عند هیجل، د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨١، ص٤٢.

٢٣) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٥٧.

٢٤) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٥٩.

٢٥) حیاة یسوع، هیجل، ترجمة-جرجي زیدان، لبنان، ١٩٨٤، ص١١٨.

٢٦) المنهج الجدلي عند هیجل، د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨١، ص٤٤.







٢٧) حیاة یسوع، هیجل، ترجمة-جرجي زیدان، لبنان، ١٩٨٤، ص١١٩.

٢٨) حیاة یسوع، هیجل، ترجمة-جرجي زیدان، لبنان، ١٩٨٤، ص١٢٠.

٢٩) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٦١.

٣٠) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٦٦.

٣١) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٧١.

٣٢) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص١١.

٣٣) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٧١.

٣٤) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٧٤.

٣٥) سیستەمی سیاسی، ریبین رەسول ئیسماعیل، وەزارەتی رۆشنبیری-سلیمانی، ٢٠٠٣، ل١٩٦.

٣٦) اصول فلسفة الحق، هیجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٩٦، ص٤٩٧.

٣٧) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٧٧.

٣٨) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٧٩.

٣٩) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٨٠.

٤٠) بونیادی زمانی فەلسەفی لەلای هیطلَ، جان هیثؤلیَت، وەرطیرِانی-رِیَبین رِەسولَ ئیسماعیل، کاروان(١٧٢).

٤١) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٨٢.

٤٢) الموسوعة الفلسفیة المختصرة، ترجمة-فواد کامل، جلال العشری، عبدالرشید الصادق، بغداد، ١٩٨١، ص٥١٨.

٤٣) عەقڵانییەت لەلای هیگڵ، جۆن کۆنتگهام، وەرگێرانی-ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، گۆڤاری نما، ژمارە(٦).

٤٤) بونیادی زمانی فەلسەفی لەلای هیگڵ، جان هیپۆلێت، وەرگێڕانی-ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، کاروان(١٧٢).

٤٥) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص١٢.

٤٦) فلسفة هیجل، عبدالفتاح الدیدی، القاهرة، ١٩٧٠، ص١٢.

٤٧) موسوعة العلوم الفلسفیة، هیجل، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، بیروت، ١٩٨٣، ص١٥.

٤٨) موسوعة العلوم الفلسفیة، هیجل، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، بیروت، ١٩٨٣، ص٣١.

٤٩) موسوعة العلوم الفلسفیة، هیجل، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، بیروت، ١٩٨٣، ص٣٩.

٥٠) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٩٠.

٥١) هیجل، الجزء الأول، د. زکریا ابراهیم، القاهرة، ١٩٧٠، ص٩١.

٥٢) الموسوعة الفلسفیة المختصرة، ترجمة-فواد کامل، جلال العشری، عبدالرشید الصادق، بغداد، ١٩٨١، ص٥١٩.

## بەشی دووەم

# هیگڵ و چەمکی فەلسەفە

(کاتێك خەریکی نووسینی بەشی یەکەمی (سەرمایە) بووم، نەوەی نویٚ، ئەو بانگەشەکارە ملهوڕو هیچو پووچانە، شانازیان بەوە دەکرد گوایە ئەوان وەکو (سەگێکی‌تۆپیو) دەڕوانـنە هـیگڵ، بۆیـە دەستپێشـخەریم کـردوو بـە ئاشکرا ڕام گەیاند، من هیچ نیم، تەنیا قوتابییەکی ئەم بیریارە مەزنە نەبێت).
(کارل مارکس)

چۆن هـیگڵ و فەلسـەفەی هـیگڵ‌ی بەشـێوەیەکی وابخوێنیـنەوە بتوانین لـەو ڕۆڵـە مـەزن و کاریگـەرە بگـەین کـە فەلسـەفەکارێکی وەکو هیگڵ لەنێو مـێژووی فەلسـەفەی نوێدا گێڕاویەتی؟ یا بەمانایەکی تر، هیگڵ بخەینە نێو چ میـتۆدێكو سـتراتیژییەتێکی هـزری تـاوەکو بـێین لـە سایەی ئەم ڕووگەو ڕەهەندەوە هیگڵ بخوێنینەوە؟ بەتایبەتیش ئەگەر ئەم ڕاستییە بزانین کە هـیگڵ دامەزرێـنەری فەلسـەفەی ئایدیالـیزمی دیالیکتـیکی نوێـیەو لـەم ڕوانگەیەشـەوە دەڕوانێـتە خـودی فەلسـەفەو پـڕۆژەی هـزریو فەلسـەفی، لـێرەدا پرسـیارێکی تـر دێتو ڕێگامـان لێدەگرێـت، ئـەویش ئەوەیـە: سـیما گشتییەکانی میـتۆدی فەلسـەفی لـە ڕوانگـەی هیگڵ‌ەوە چییە؟ ئێمەش لەم بەشـەدا لـەو پرسـیارەوە دەسـت بـە هەڵکۆڵینی فەلسەفەکەی هیگڵ دەکەین، بـۆ ئـەوەی بـتوانین لـە چـەمکی فەلسـەفە لەنێو فەلسەفەی هیگڵ تێبگەین.





لـێرەدا دەبێـت ئـەوەش ڕوون بکەیـنەوە کـە ئـێمە بـەردەوام قسـە لەسـەر فەلسـەفەی هـیگڵ دەکـەین، واتـا هـەر ڕاڤەکردنـێكو شـیکارکردنێك لـە ڕوانگـەی بۆچوونە فەلسەفییەکانی هیگڵ‌ەوە سەرچاوە دەگرێتو بەپشت بەستن بەو تێڕوانینانەوە ئێمە قسەکانی خۆمان دەکەین.

نووسـەری فەرەنسی کواریـیە کاتـێك قسـە لەسـەر نووسـینەکانی هـیگڵ دەکـات، دەڵێـت: (مرۆڤ کاتێك هیگڵ دەخوێنێتەوە، زۆرجار وا هەست دەکات لە هیچ شتێك تێناگات، لە وەش ترسناکتر ئەوەیە تەنانەت ئەو کاتەی تێش دەگات، وا هەست دەکات کە تێناگات، یا ئەو‌بەلایەنی کەم‌زۆرجار وا هەست دەکات ئەزیەتـێکی زۆر لـە بەردەوامبوون دەخوات، زۆرجاریش مرۆڤ کاتێك هـیگڵ دەخوێنێـتەوە خـەیاڵی ئـەوە دەکـات لـە بـەردەم کـرداری پاڵەوانانەی سـەرنجڕاکێش یـا شـێوەیەك لـە شـێوەکانی سـیحرو جادووبازیدایـە، هەندێکجاریش مرۆڤ زەحمەتییەکی زۆری تووش دێت لەوەی بڕوا بە خۆی بێنێـت کـە لەبەرانـبەر مەسـەلەیەکی جـیدی دایـەو هـیگڵ‌یـش گاڵـتەمان پێناکاتو بەچاوی سووکەوە تەماشامان ناکات).(١)

لەگـەڵ ئەوەشـدا، واتـا لەگـەڵ ئـەوەی خوێـندنەوەی فەلسـەفەی هـیگڵ کـارێکی قـورسو زەحمەتـە، بـەڵام لەگـەڵ ئـەم بۆچـوونەی فـندلی یـەك دەگریـنەوە کـە دەڵێـت:( خوێـندنەوەی هـیگڵ زۆرجـار تلانەوەیـە بەدەسـت شێوەیەك لە شێوەکانی ئازاری عەقڵی، بەڵام مەزنێتی هیگڵ لەوەدایە مرۆڤ کـەمجار وا هەسـت دەکات ئەم ئازارە بێهودەو بێسوود بێت)(٢). بەڵام، ئایا ڕاسـتە تێگەیشـتنو لێکۆڵیـنەوە لەفەلسـەفەی هـیگڵ سـنوورو ئاسـتێکی دیاریکـراوی هەیـە؟ هـزرڤانی فەرەنسی جاك دۆنت پێیوایە( لێکۆڵینەوە لە هیگڵ کۆتایی نایێت، چونکە هیگڵ جیهانێکی تایبەتە )(٣).

هـیگڵ پـێی وایـە فەلسـەفە سیفەتێكو خاسیەتێکی زۆر گرنگی بەدەست نەهێـناوە، کەچـی زانسـتەکانی تـر ئـەم سیفەتو خاسـیەتەیان دەسـگیر کـردووە، ئـەویش وەکو ئـەوەی دیـارەو ئاماژەی بـۆ دەکات، بریتییـە لەوەی بوونی بابەتەکانی خۆی لەسەر ئەوە بونیاد بنێت کە وشیاری بە شێوەیەکی





سروشتی بەبێ دوودڵیو دڕدۆنگیو گومان بڕوایان پێبکات، واتا بەشێوەیەکی تر بابەتە فەلسەفییەکان بابەتێکی لەم جۆرەن کە سانا نییە وشیاری ئاوا بەشێوەیەکی سروشتی بڕوایان پێبکات، بەڵکو بابەتە فەلسەفییەکان بەردەوام بابەتێکن ئەنگێزەی گومانو دوودڵی دەکەنو ئەستەمە بەردەوام بتوانرێت مرۆڤ لێیان دڵنیا بێت، لەپاڵ ئەوەشدا ناتوانێت گرەنتی ئەوەشمان پێبدات کە میتۆدی پەیڕەوکراو لەنێو لێکۆڵینەوەو مەعریفەی فەلسەفیدا میتۆدێکی قەبوولکراوەو ڕەتناکرێتەوە، واتا ئێمە گومان دەکەین بتوانین میتۆدێك بگرینەبەرو لەسایەی ئەم میتۆدەوە ئەنجامی هزری گرنگ وەدەست بێنین، بەڵام لەبەرانبەر ئەم دوو سیفەتو خاسیەتە بەدەست نەهێنراوەی فەلسەفەدا، خاسیەتو سیفەتێکی تر هەیە وا لە فەلسەفە دەکات دیسان لەزانستەکانی تر جیاواز بێت، ئەویش ئەوەیە بابەتەکانی فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی هەمان بابەتەکانی ئایینە، چونکە پێی وایە بابەتی لێکۆڵینەوەو مەعریفەی هەردووکیان، واتا فەلسەفەو ئایین، بریتییە لە گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، بۆیە فەلسەفەو ئایین یەك بابەت کۆیان دەکاتەوە، ئەویش حەقیقەتە، حەقیقەتیش بەمانا باڵاکەی بریتییە لەوەی خوا، تەنیا خوا بریتییە لەحەقیقەت. لێرەدا هەریەك لەفەلسەفەو ئایین بە شێوازو ڕێگایەکی تارادەیەك هاوشێوە بەرەو چارەسەرکردنی دوو جیهانی موتەناهی دەچن، ئەم دوو جیهانەش بریتین لە جیهانی سروشتیو رۆحیو موتەناهی، لەوە دەکۆڵنەوە کە چ جۆرە پێوەندییەك بە یەکتریان کۆدەکاتەوەو دەیانبەستێتەوە. ئەوە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە چ پێوەندییەکیان بەخواوە هەیە، بەو سیفەتەی خوا حەقیقەتی ڕاستەقینەی هەردووکیانە. لەنێو فەلسەفەی هیگڵ-دا، ئایین بەتەنیا بڕوایەکی ڕەها نییە بکەوێتە دەرەوەی مەعریفەی مرۆڤایەتی، بەڵکو ئایینو مەعریفە دێن سیفاتی خۆیان ئاڵوگۆڕ دەکەن، ئایین مەعریفەی ڕەها بە مەعریفە دەبەخشێت، مەعریفەش دێت مەعقولییەت بەئایین دەدات، لێرەدا فەلسەفە بریتییە لە وشیاری بەماهییەتی تایبەتی







خۆی، بۆیە لەلای هیگڵ فەلسەفە دێت ئیدراك بەشتەکانو سروشتو مێژوو دەکات، ئەم ئیدراك کردنەی فەلسەفە ئیدراك کردنێکی ئەم بابەتانەیە لەسەر حەقیقەتی خۆیان، وەکو ئەوەی شێوازێك بن بۆ ئەوەی رۆح لەسایەیانەوە خودی خۆی بەدی بێنیت. فەلسەفە واتا ڕاگەیاندنی هاتنی رۆحو بڕواکردن بەوەی ئەم هاتنە ڕاڤەکردنێکی تۆتالیتارییان پێدەدات، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە واقیعن(٤).

هیگڵ پێی وابووە کە ئایین-بەتایبەتیش مەزهەبی پرۆتستانی-و فەلسەفە خاوەنی یەك ناوەڕۆکن، بەڵام ئەم ناوەڕۆکە لەحاڵەتی ئاییندا شێوەی ئیمانو سۆزو ویژدان وەردەگرێت، کەچی لەحاڵەتی فەلسەفەدا شێوەیەکی عەقلانی بەرجەستە دەکات، ئەم بۆچوونەی هیگڵ لەلای نۆکس لەتێزەکانی لۆتەرەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە ئەو زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری ڕاو بۆچوونەکانی لۆتەر، ئەمەو بۆچوونەکانی لۆتەر-یش زیاتر جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە مروڤی مەسیحی نابێت ڕوو بە ڕووی دەسەڵاتی زەمەنی ببێتەوە، ئەم تێڕوانینەی لۆتەر بنچینەی بۆچونی هیگڵ-ە بۆ پێوەندی نێوان دەوڵەتو کڵێسا(٥). بەم شێوەیە پێویستە فەلسەفە بانگەشەی ئەوە بکات کە بە شێوەیەك لە شێوەکان دەزانێت مەعریفەی خۆی چییەو چۆنە، واتا دەبێت فەلسەفە ئەوە بزانیت کە مەعریفەی ئەو پەیوەستە بەمەعریفەو ناسینی حەقیقەت، مەعریفەو ناسینی حەقییقەتیش، واتا مەعریفەو ناسینی خوا، لەبەرئەوەی خوا بۆ خۆی تاکە حەقیقەتە لەنێو گەردووندا. فەلسەفە دەبێت بایەخ بەم بابەتانە بدات، چونکە زەین نموونەو نمایندەی زەینی لەبارەی ئەم بابەتانە لەلای خۆیەوە دروست دەکاتو پێکدەهێنێت، ئەم کردەیەی زەین ئەنجامی دەدات لەلایەنی زەمەنییەوە دەکەوێتە بەر لەزەمەنی دروستکردنو پێکهێنانی هزری تۆتالیتاری گشتگیر کە دواتر مرۆڤ لەلای خۆیەوە هەر لەسایەی زەینەوە دروستیان دەکات، تاوەکو لەسایەیانەوە لەحەقیقەتی گەردوونی بگات، تەنیا لەڕێگای ئەم نمایندە زەینییانەو بەیارمەتی

ئەوانەوە زەینی بیرکەرەوە دەتوانێت بگاتە ئاستی زەینێکی مەعریفیو بەشێوەیەکی هزرییانە بیربکاتەوەو تێبگات، بەڵام هەر زوو بەزوو لەگەڵ ئەم توێژینەوە هزرییە لە شتەکان، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هزر قەناعەتو بڕوا بەم لێکدانەوانە ناکات ئەگەر بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا نەسەلمێندرێتو بەلگەو دەلالەت لەسەر بوونی بابەتەکانی بەدەست نەهێنێتو بەلگەی دەست نەکەوێت لەسەر سروشتی ئەم بابەتانەو چۆنیەتی ئەنجامدانیانو ئەنجامەکانیان، ئەوەش تێڕامانو لێکدانەوەیێکی تەواو مەعریفیو فەلسەفییە، چونکە یەکێك لەڕایەڵەکانی فەلسەفە گومان کردنە، یەکەم هەنگاو بۆ کاری فەلسەفی بریتییە لەگومانکردن یا بڕیار نەدانو ڕاگرتنی حوکمدان لەسەر شتو هزرو بیرو بۆچوونەکان، لێرەدا لەلایەنی بابەتو میتۆدەوە فەلسەفە ناتوانێت ئەو شتە بکات کە زانستەکانی تر بە شانازییەوە ئەنجامی دەدەن، ئەویش بڕوا کردنە بە هەنگاوی کارکردنو بڕواکردنە بەو شتەی بوونی هەیە. فەلسەفە پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە پێویستە بۆ ئەوەی بڕوا بە کردەیەکی مەعریفیو ئەنجامێکی ئەپستمۆلۆژیو هزری بکەین، دەبێت بەشێوەیەکی عەقڵییانە بەلگەمان بەدەستەوە بێت، بەلگەی ئەوەی ئەم بابەتە بابەتی پێویستە، یا ئەم میتۆدەی لەنێو لێکۆڵینەوەی مەعریفیدا پراکتیك دەکرێت تاکە میتۆدی شیاوە بۆ فەلسەفەو کاری فەلسەفی. فەلسەفە بۆ ئەوەی بەڕاستی ببێتە مەعریفەیەکی ڕێکخراو پێویستە هیچ میتۆدێك لەکایەیەکی مەعریفی یالقێکی زانستی تر نەخوازێتو قەرز نەکاتو کاری خۆی پێ ئەنجام بدات، بەڵکو دەبێت خاوەنی میتۆدی هزریو لۆژیکی سەلمێنراوی تایبەت بەخۆی بێت، جگە لەوەش نابێت بڕوا بەبانگەشەکانی حەدس بکات، یا ئەو بەلگانە بەکاربێنێتو پشتیان پێ ببەستێت کە لەبنەڕەتدا لەسەر ڕایەڵی هزری دەرەکی بونیادنراون، بەڵکو فەلسەفە دەبێت لەسایەی پشکنینو ئەزموونەوە بەلگەی  وا بەدەست بێنێت کە





بشێت لەنێو لێکۆڵینەوەی فەلسەفیدا پشتیان پێ ببەسترێت، هەروەها نابێت فەلسەفە بەکارهێنانی بەهەڵەی بەلگەخوازیش ئەنجام بدات.

ئەم بۆچوونەی هیگڵ-یش بۆ بڕوا نەکردن بەحەدسو بانگەشەکانی حەدسو هەست، دیارە لەو چوارچێوە ئایدیالیستییەوە سەرچاوە دەگرێت کە فەلسەفەو تێڕوانینی فەلسەفی هیگڵ-ی لێ هەڵهێنجراوە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە بەکارهێنانی بەهەڵەی بەلگەخوازی چییە؟ مەبەستمان ئەوەیە مرۆڤ زۆرجار بەلگەی وا بۆپاڵپشتی کردنی بۆچوونەکانی خۆی دێنێتەوە کە مەرج نییە لەهەموو کاتو ساتێکدا ڕاستو دروست بن، دەشێت بەردەوام بەشێك لەم بەلگانە فریومان بدەنو هەڵمان بخەڵەتێنن، بۆ نموونە، من لەنێو کۆڕی کۆمەڵێك برادەر دادەنیشم، لەناکاو دەلەرزمو هەست بەسەرما دەکەم، لەو کاتەدا من وا هەست دەکەم دنیا ساردە، بۆیە من لەسەرمان هەڵدەلەرزم، کەچی لەواقیعدا وانییە، دنیا سارد نییە، بەڵکو ئەوە منم باری تەندروستیم باش نییەو هەست بە سەرما دەکەم. لێرەدا ئەگەر من سەرمابوونی خۆم بکەم بە بەلگەی ئەوەی دنیا ساردە، ئەوە دیارە من دووچاری هەڵەی بەلگەخوازی دەبم، ڕاستە من هەست بە سەرما دەکەم، بەڵام دنیا سارد نییەو منیش نابم بە بەلگەی سەلماندنی ڕاستی سەرما.

نموونەیەکی تریش دێنمەوە، قەڵەمێك دەخەمە نێو پەرداخێك ئاو، من ئەم قەلەمە بەشکاویو بەدوو پارچەیی بەدی دەکەم، بەڵام ئایا ڕاستە قەڵەمەکە شکاوە؟ بێگومان نەخێر، قەڵەمەکە ساغو سەلامەتە، ئەوە چاوی منە فریو دەخواتو هەڵدەخەڵەتێت. ئەوانەو کۆمەڵێك بەلگەی تری لەم شێوەیە بوونیان هەیە، کاتێك بەگشتی دەکرێن، ئێمە ناویان دەنێین هەڵەی بەلگەخوازی، بەهەڵە بەکارهێنانی بەلگە.

هیگڵ فەلسەفەکارێکە تا سەرئێسقان ئایدیالیست، لە دەرەوەی ئەم ڕووگەو گۆشە نیگایەشدا ڕووگەیەکی تر بەدی ناکات، لەم ڕەهەندەشەوە هیگڵ ئەوە ڕەتدەکاتەوە مەعریفە ئیدراك پێکردنێکی تەواو هاوشێوەو





هـاودەق بوونـی شـتە ئـیدراك پـێكراوەكان بێـتو ئـەو شـتانەش بۆخۆیـان بوونـی دیـارو ئاشـكراو سـەربەخۆیان هەبێت دوور لـەو عەقڵەی ئیدراكیان پـێدەكات. لـەلای هـیگڵ ئـێمە دەبیـنین وشیاری لەسـایەی فینۆمینـۆلۆژیای ڕۆحـدا هـێدی هـێدی لەشـێوەی سـەرەتایی هەسـتناكەوە بـەرێوە دەچێت، تا دەگاتــە ئاســتی زانســتی، فینۆمیـــنۆلۆژیای ڕۆح بزاڤــێكی هاوســەنگی دوولایەنەیـە، بزاڤـێكی دیالیكتیكیـیە، چـونكە لەسـایەیەوە خـود لەنــێو بابەتـێكی دەرەكیدا بـەدوای یەقینـدا دەگەڕێت، لەكۆتاییشدا لەنـێو خودی خۆیـدا یـەقین دەدۆزێـتەوە. ئـەم بـزاڤە مێژووی ونبوونی خودە لەدەرەوەی خۆیـدا، بەرلـەوەی لـەناوەوەی خۆیدا بیدۆزیتەوەو بەدی بكات. مەبەستیش لـەم گەڕانـەی ڕۆح مەعـریفەی ئەوەیـە كەچـی لەسـەریەتی تاوەكو بیگرێتە ئەسـتۆی لەنـێو سـیاقی ئـەو یەقیـنانەی لەبابـەتی مەعـریفەوە بـۆی دێـت. سـەرەتا دەبیـنین هـیچ شـتێك نیـیە یەقیـنی هەسـتی بیگرێـتە ئەسـتۆ، لەكۆتاییشـدا دەبیـنین هـەموو شـتێك هەیـە تـاوەكو بیگرێـتە ئەسـتۆ. ڕۆح لەیەقیـنی هەسـتییەوە وادێـتە بەرچـاو گوایـە دەوڵەمەندترین مەعریفەیە، كەچـی لەواقـیعدا هەژارتـرین مەعـریفەیە، لەبەرئـەوەی تەنـیا پەیوەسـتە بەئێستاو ئێرەوە، بگرە ئێرەو ئێستا لەنێو ئەو بابەتەدا نین كەوا دەگۆڕێت، بـەڵكو لەنـێو ئـەو(مـن)ە جێگیرە دایە كە دەربڕی هەموو ئێرەو ئێستاییێكە، بـەڵام ئـەو مەعـریفەیەی مـن لـەبارەی ئێسـتا وەری دەگرێـت، بـەردەوام مەعــریفەیەكی مــام ناوەندیــیە، لەبەرئــەوەی پەیوەســتە بەداماڵێــنی ئێسـتایەكی پێشـووتر، ئـەو مەعـریفەیەی كـە ئێسـتایەكی پێشـووتریش دادەماڵێـت، بریتیە لە ئیدراك-دواتریش لەنێو ئەم لێكۆڵینەوەیەماندا زیاتر قسـە لەسـەر بۆچـوونی هیگڵ دەكەین سەبارەت بە پەیوەستبوونی فەلسەفە بە ئێستاو ئێرەو سەردەم.

ئـیدراك یـەك تاكـە شـت بەچـەندین سـیفاتی جـیاواز درك پـێدەكاتو یەكسانی بابـەت لەگەڵ خـودی خۆیدا بەردەوام دەبێت، جا كرداری ئیدراك ڕوویـدا بێـت یـا ڕووی نەدابێـت، كەواتــە لەلایـەنی بابەتیـیەوە ئـیدراك





گەیشتۆتە یەقین، بەڵام سیفاتە هاوكاتو هاودژەكان دژایەتی یەكێتی بابەت دەكـەن. بـۆ پارێـزگاری كـردن لـەم یەكێتیـیە، (مـن)ی مـودرك سـیفاتەكان دەخاتـە ئەسـتۆی خـۆی، بابـەت بـۆ خـۆی لەنـێو خودی خۆیدا یەك بابەتە، سوور نابێـتە سـوور تەنـیا ئەگـەر چاوی بخرێـتە سـەر، واتا چاوێك هەبێت ڕەنگەكـەی دیـاری بكـاتو بـەدی بكـات، بەبێ بوونی ئەم چاوە هیچ ڕەنگێك بـەهای نییە، شتێكیش شیرین، یا تاڵ نییە ئەگەر زمانی لێ نەدرێت، چونكە دیسان بـەبێ تـام كـردن شـیرینی یـا تـاڵی هـیچ مانایەكیان نییە. بەڵام ئەم یەكێتیـیە سـادەیە بـۆ خـود لـەم حاڵەتـەدا دەگەڕێـتەوە بـۆ بابـەت، ئـەم یەكسانییەش لەگەڵ خوددا ناكرێت بزانرێت، تەنیا بەو ئاستە نەبێت كە بابەتەكە خودی خۆی لەگەڵ خودەكانی تـر بـەراورد دەكات، كەواتـە بەو ڕادەیـەی دەبێـتە خـاوەنی سیفەتێكی جیاكەرەوە لەدەسپێكی ئەو چركەیەی كـەوا یەكێـتی لەفـرەیی لەنـێو بابـەتدا جـیا دەكرێـتەوەو ڕاوبۆچوون تێیدا جیاواز دەبێـتو هـەر یەكێكیان بانگەشەی ئەویتریان دەكات، ئەوە ئەو كات بابەتـێك لەبەردەسـتی ئـیدراك نامێنێت، بـەڵكو دەچێتە بەردەستی عەقڵ. لێرەدا ئێمە بەرەو بازنەی تێگەیشتن بازدەدەین(٦).

تێروانینــێك لەبۆچـوونەكانی هـیگڵ، دیـارە چـەندە سـوودی لەتـیۆری گومـانی ئەپستمۆلۆژی دیكارت وەرگـرتووەو چـەندەش تەكریسی كـردووەو جەختی لەسەر دەكاتەوە تاڕادەی ئەوەی دەگاتە ئەو باوەڕەی ئێمە لەسایەی ئـەم گومانەمانـەوە ئـەوەمان بـۆ ئاشكرا دەبێت كە نـاتوانین گـریمانی هیچ شـتێك بكەین یا بڕیار لەسەر هیچ شتێك بدەین بەشێوەیەكی یەكلاكەرەوە، جگـە لـەوەی ئـەم حاڵەتـەی خۆمـان، حاڵـەتی دوودڵـیو دڵەڕاوكـێی خۆمـان لـەوەی نـاتوانین هـیچ گریمانـێك بخەیـنە ڕوو، بـەرەو ئەنجامێكی لۆژیكیمان ئاراسـتە دەكـات، ئـەویش ئەوەیـە كـە لەهـەمان كاتیشـدا نـاتوانین گوتـەو گـریمانی هـیچ كەسـێكی تـریش قـەبوڵ بكـەین، ئـەوەش واتـا ئـێمە لـە نـێو دەریایـەك لـە گومـاندا مەلـە دەكـەین، لەگەڵ ئەوەشـدا بۆئەوەی بتوانین لە مەلەكـردن بـەردەوام بـین، بۆئـەوەی بـزانین لـەكوێوە دەست پـێدەكەینو

بەرەو کوێوە کەوتووینەتە ڕێگا، ئەوە دەبێت خاڵی دەسپێكو سەرەتا بۆخۆمان دیاری بکەین، بەڵام چۆن خاڵی سەرەتا دەستنیشان دەکەین؟ هیگڵ پێی وایە بۆ دەستنیشانکردنی خاڵی سەرەتا، ئەوە نابێت هیچ شتێك لەشتێکی ترەوە هەڵبهێنجین، چونکە سەرەتا واتا دەسپێك، لەنێو کاری فەلسەفیو هزریدا بریتییە لەوەی ئێمە گریمانێکی دیاریکراو بخەینەڕوو و کاری لەسەربکەین بۆ ئەوەی لێی دڵنیابین، بەڵام کاتێك گریمانێك دەخەینەڕوو و کاری لەسەر دەکەین، ئەوا ڕاستەوخۆ ناچینە نێو نێوەندو سێنتەری کاری فەلسەفی؟ بەڵێ کارکردن لەسەر هەر گریمانێك واتا کارکردن لەسەر فەلسەفەو هزر، بەم شێوەیەش ئێمە دەگەینە ئەو باوەڕەی ئەستەمە سەرەتایەك بوونی هەبێت.

بەڵام(چۆن میتۆدێك دەستپێدەکات ؟)(٧)، ئەوە پرسیاری ئێمە نییە، ئەوە پرسیاری کیرکیگاردە، چونکە ئەو پێی وایە ئەم پرسیارە یەکێکە لەو کێشانەی ڕوو بەڕووی هیگڵ بوونەتەوە، بەڵام ئەو نەیتووانیوە چارەسەری بکاتو بەردەوام لەدەوریدا خولاوەتەوە. کیرکیگارد جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هیگڵ لەکۆتاییدا هات ئەم کێشەیەی سڕیەوەو بەلاوەی ناو بانگەشەی ئەوەی کرد گوایە مەزهەبەکەی ئەو پشت بە هیچ گریمانەیەکی پێشووتر نابەستێت، چونکە بەشێوەیەکی ڕەها دەست پێدەکات. ئالێرەدا دەشێت بپرسین، بەڵام ئەگەر بزاڤی هزری بزاڤێکی بێ کۆتایی بێت، ئەوە هیگڵ چۆن توانیویەتی ئەم بزاڤە هزرییە بووەستێنێت بۆ ئەوەی مەزهەبەکەی خۆی دەست پێبکات؟ بێگومان لەنێو بزاڤی هزریدا شتێك نییە بەناوی سەرەتای بێ گریمانی پێشینە، چونکە ئەگەر بە ڕەهاییش گریمانی هیچ شتێك نەکەین، دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو عەقڵەی ئەم سەرەتایە پێیدا دەستی پێکردووە، بۆ خۆی شتێکی گریمانکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە مەزهەبی هیگڵ مەزهەبێکی بازنەییە، مادام مەزهەبی هیگڵ مەزهەبێکی بازنەییە، دەکرێت لەکۆتاییدا بەڵگە لەسەر ڕاستی سەرەتا بەدەستبێنێت. لێرەدا گومانکردن لەبوونی





سەرەتایەك بۆ دەست پێکردن لای هیگڵ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دەشێت سەرەتای گریمانکراو هەڵە بێت، یا بەلایەنی کەم جێگای گۆمان بێت، بۆیە لێرەدا هیگڵ هاوشێوەی دیکارت بیر دەکاتەوە، دیکارت لەکتێبی( پرنسیبەکانی فەلسەفە)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێمە بۆ ئەوەی ڕاستی بپشکنین، دەبێت گومان لەهەموو ئەو شتانە بکەین کە ڕوو بەڕوومان دەبنەوە، لەبەرئەوەی مرۆڤ لە قۆناغەکانی گەشەکردنی فسیۆلۆژیداو لەماوەی ژیانیدا چەندین جار بڕیاری ڕاستو هەڵە بەسەر دیاردەکاندا دەردەکات، بۆیە کاتێك عەقڵ بۆ گەیشتن بە مەعریفەی ڕاستەقینە بەکاردێنین، لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە کە هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە، تاوەکو خۆمان لەم هەموو بڕیارە هەڵانە دەرباز بکەین، ئەگەر ڕێگای گومانکردن نەگرینە بەر، بۆیە لەلای ئەو پێویستە مرۆڤ گومان لەهەموو شتێك بکات کە جێگای گومانو دڵەڕاوکێ بن.

دیکارت لەکتێبی(تێڕامانی میتافیزیکی لەفەلسەفەی یەکەم)یشدا جەخت لەسەر ئەم شێوە گومانە دەکاتەوە، بۆیە باس لەوە دەکاتەوە کە ئەو لە تەمەنێکی زوودا هەندێك ڕاوبۆچوونو تیۆری وەرگرتووەو پێی وابووە ڕاستو دروستن، کەچی دیارە ئەوەی لەسەر ئەم ڕاوبۆچوونانە بونیادی ناون، هەمووی جێگای دڵەڕاوکێو دوودڵیو گومانکردنە، بۆیە دەگاتە ئەو باوەڕەی پێویستی بەوە هەیە، ئەگەر بۆ جارێکیش بێت، بەڵام دەبێت خۆی لەهەموو ڕاوبۆچوونەکان دابماڵێتو هەموو ئەو شتانەش بڕووخێنێت کە لەسەر ئەم بۆچوونانەی بونیادی ناون، تاوەکو سەر لەنوێ مەعریفەکانی خۆی بخاتەوە خانەی ئەزموونو تاقیکردنەوە(٨). بەم جۆرەش هیگڵ هاوشێوەی دیکارت دەستی بەگومان کردووە، گومانەکەی هیگڵ لەوە دایە ئەو ناتوانێت خاڵی سەرەتای دەست پێکردن بدۆزێتەوە، ئەگەر ئەم خاڵەشی دۆزیەوە؟ کێ گەرەنتی ئەوەی پێدەدات کە گریمانێکی هەڵە نییە؟

دەکرێت بەگشتی وەسفی فەلسەفە لەلای هیگڵ ئەوە بێت کە: بریتییە لە توێژینەوەی هزری لەشتەکان. بەڵام ئەوە وەسفێکە زۆر لەوە فراوانترە





بشێت دەستنیشانی بکەین، ئێمە بەردەوام دەڵێین هزرو بیرکردنەوەیە مرۆڤ لەجیهانی ئاژەڵ جیا دەکاتەوە، سەردەمانێکی زۆریش لەمەوبەر فەلسەفەکاری گریکی سوقرات وا وەسفی مرۆڤ دەکات گوایە ئاژەڵێکە دەتوانێت قسە بکات، دیارە قسەکردنو ئاخافتنیش ئەنجامی بیرکردنەوەو کردەی هزرین، بۆیە ئێمە کاتێك لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە کە شتێك مرۆڤایەتییانەیە، ئەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گەرەکمانە بڵێین شتێکە پەیوەستە بەکردەی هزرو بیرکردنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ دەزانێت بیرکردنەوەو فەلسەفە مەرج نییە یەك شت بن، مەرج نییە هەموو کردارێکی بیرکردنەوە بچێتە نێو قاڵبی بیرکردنەوەو تێڕامانی فەلسەفی، چونکە فەلسەفە بۆخۆی جۆرێکی زۆر تایبەتی بیرکردنەوەیە، جۆرێکە بیرکردنەوە تێیدا دەگۆڕێت بۆ مەعریفە، مەعریفەیەك لەسایەی هزری گشتگیرەوە، بۆیە دوو شێوازی بیرکردنەوە، هەرچەندە لێکنزیكو هاوشێوەش بن، بەڵام شێوازی تێڕامانو بیرکردنەوەی فەلسەفی جیاوازە لەئاست بیرکردنەوەی گشتی کە بەشێکە لەهەموو چالاکییەکی مرۆڤایەتییانەو بۆتە سیماو مۆرکی مرۆڤ، ئەم جیاوازییەش لەحەقیقەتێکی زۆر گرنگەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەویش ئەوەیە کە دیاردەکانی وشیاری، ئەو دیاردانەی کە دیاردەی مرۆڤایەتینو هزر پاڵنەری سەرهەڵدانیانە، بۆیەکەمجارو سەرەتا لەشێوەی بیرۆکەیەك سەرهەڵنادەن، بەڵکو سەرەتا لەشێوەی ویژدان، یا ئیدراکی هەستی وێنەی زەینی دێنەبوون، ئەوانەش هەموو لایەنی وان دەبێت زۆر بە وردی جیاوازییان لەنێواندا بکەین، بە بەراورد لەگەڵ وێنەی هزریدا، کەچی ئێمە وەکو ئەوەی بەدی دەکەین دەبینین هیگڵ لەزیاتر لەشوێنێك لەنێو نووسینەکانیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە فەلسەفە: بریتییە لە دۆزینەوەی توخمی عەقڵی. هەر بۆیەش لەلای ئەو ئەم هۆکارەی گەڕان بەدوای عەقڵو دۆزینەوەی، خۆی لە خۆیدا بریتییە لە ئیدراك کردنی بەئێستاو بەواقیع بەشێوەیەکی کردارەکییانە. فەلسەفە توێژینەوەیە لەجیهانی





کردارەکییانەی واقیع، بۆیە کاری ئەوە نییە جیهانێکی میتایی بونیادبنێت، جیهانێك لەخوا زیاتر کەس نازانێت دەکەوێتە کوێ، چونکە لەلای هیگڵ کەس بەیەقینی نازانێت لە کوێدا بوونی هەیە. هیگڵ پێی وایە فرمانی سەرەکی فەلسەفە ئەوەیە ئەو دژکارییانەی کە ئەو بە دیالیکتیك ناویان دەبات بەلاوە بنێتو ڕەش بکاتەوە، ئەوەش لەپێناو گەیشتن بە بالاترین پلە لەپلەکانی گونجاندن، بەم شێوەیەش نەزعەی لۆژیکی گشتگیری هیگڵ، هاوشانی نەزعەی ڕەشبینانەی گشتگیری خۆیەتی، بۆیە فرمانی هەرە مەزنی سەرشانی فەلسەفەکار ئەوە نییە کار لەپێناو گۆڕینی جیهان بکات، بەڵکو کاری ئەوەیە لەجیهان بگاتو لەگەڵیدا بگونجێت-دواتر مارکس دێت ئەم گووتەیە دەگۆڕێتو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فەلسەفەکار کەسێکە دوسکاری جیهان دەکات بۆ ئەوەی بیگۆڕێت-هەر بۆیەش کاتێك هیگڵ دەڵێت: فەلسەفە وەکو کوندە پەپووی مێنرفا وایە، نافڕێت تاوەکو تاریکی دانەیێت. ئەوە مەبەستی ئەوە بووە کە فەلسەفە دواتر دێت، واتا پاش ئەوەی هزری یەکەم کاری خۆی دەکات، هەر بۆیەش فەلسەفەی بەهزری دووەم ناوبردووە، لێرەدا فەلسەفە دەبێتە ڕاڤەکردنێکی هەمەکییانەی جیهانو مێژوو(٩).

## فەلسەفە......هزری دووەم

هەندێك بیرو بۆچوونی لابەلای پێشینە هەیە، هیگڵ-یان بێزار کردووە، ئەو بیروباوەڕو بۆچوونانەی جیاوازیو کەلێن دەخەنە نێوان هزرو ویژدان(هەست)، بەشێوەیەك وا نمایشیان دەکەن گوایە دژو ناکۆکن. ئەم بیرو بۆچوونانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هزر دەبێتە هۆی ئەوەی هەست پیس بکاتو بیشێوێنێت، لێرەدا مەبەست هەستی ئایینییە، واتا بەتەنیا هەستی ئایینی ناشێوێنێت، بەڵکو هزر دێت هەستی ئایینی





لەناویش دەبات، لەوەش زیاتر ئەم بۆچوونانە بەتووندی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئایینو عیبادەت دوور لەهزرو تێڕامانی هزری هاتوونەتە بوونو گەشەیان کردووەو پشتیان بەشتێکی تر بەستووە جگە لەهزر. هیگڵ-یش کاتێك دێت بەرپەرچی ئەم ڕاو بۆچوونانە دەداتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایە ئەو کەسانەی ئەم بۆچوونە بلاودەکەنەوە ئەوەیان لەیاد کردووە کە مرۆڤ تاکە بوونەوەرە لەنێو گەردووندا خاوەنی ئایین بێت، چونکە ئاژەڵو بوونەوەرانی تر هەرچەندەی خاوەنی ئایین نین، لەپاڵ ئەوەشدا خاوەنی یاساو ئەخلاقیش نین. بە بۆچوونی هیگڵ ئەو کەسانەی جەخت لەسەر ئەم لەیەکتر دابڕانەی نێوان ئایینو بیرکردنەوەی هزری دەکەن، لەژێر کاریگەری شێوازێکی تایبەتی بیرکردنەوەدان، ئەو ناوی دەنێت بیر کردنەوەی دواتر، یا بیرکردنەوەی دووەم، لێرەشدا مەبەستی بیرکردنەوەی(ئاوەژووکاری)یە کە بەدوای هزرەکاندا دەگەڕێتو ڕەوانەی نێو وشیاریان دەکات. دیارە ئیدراك کردنی ئەم جیاوازییە (لەنێوان هزر بەشێوەیەکی گشتیو هزری ئاوەژوکاری)مەسەلەیەکە فەلسەفە بایەخی پێدەدات، بەڵام بائێمە لێرەدا کەمێك قووڵتر بچینە نێو هزری هیگڵو بزانین مەبەستی لە هزری ئاوەژووکار چییە؟

ئاوەژووکردن-reflpction، بەئەڵمانیش reflexion، بەمانای ئاوەژووکردنەوە، یا تێڕامانو بیرکردنەوەش دێت، بۆیە دەبینین د. ئیمام عبدالفتاح بەردەوام بەناوی بیرکردنەوەی ئاوەژووکار بەکاری دێنێت، ئەوەش تاوەکو هەردوو کردەی ئاوەژووکردنو بیرکردنەوە بەیەکەوە لەنێو یەك مانادا کۆبکاتەوە(١٠). ئەم کارەی د. ئیمام-یش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کەخودی هیگڵ-یش بەردەوام بیرکردنەوەی تایبەت بەفەلسەفەو نێوان ئاوەژووکردنەوە بەیەکەوە پەیوەست دەکات، لەبەرئەوەی پێی وایە بیرکردنەوە لەشتێك بریتییە لەهەوڵو کۆشش بۆ ناسینی ئەم شتە، ناسینێك کە لەلایەنی سروشتیو عەقڵییەوە بێت، نەوەکو لەلایەنی ڕاستەوخۆیەوە، واتا ئەم شێوە ئاوەژووکراوەی ڕاستەوخۆ لەبوونی





حەقیقەت خۆیدا هەڵهێنجراوە. ئەم خاڵەیە وا دەکات ئاوەژووکردنەوە بە تێڕامانی تیۆری پەیوەست بکات.

ئێمە زۆرجار لەلای هیگڵ ئەوە بەدی دەکەین کە ئەو دێت فەلسەفە بەهزری دووەم یا هزری دواتر ناودەبات، لەوەشدا مەبەستێکی زۆر تایبەتی خۆی هەیە، چونکە گەرەکییەتی بڵێت هزرێك هەیە بەناوی هزری یەکەم، هەر ئەم هزرەشە ڕۆژانە لەنێو سەرجەم بوارە ژیارییەکانی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات، پەیوەستە بەژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ. فەلسەفە دێت ئەم هزرە یەکەمە دەکات بەبابەتی لێکۆڵینەوەی خۆی، بۆیە فەلسەفە دەبێتە(هزری هزر)، یا هزری دووەم، یا هزری دواتر، بەم شێوەیە فەلسەفە دوای هزری یەکەم دێت، واتا پاش دەکەوێت، ئەو کاتە دێت کە ژیان هاتۆتە بوونو چەندین سیستەمیش بوونیان هەیە، ئەو کاتە فەلسەفە دێت بۆ ئەوەی سیستەمەکان ئاراستە بکات. بێگومان لێرەدا مەبەستی هیگڵ لەسیستەمەکان بەتەنیا سیستەمی سیاسی نییە، بەڵکو بەگشتی سیستەمی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ئایین-یش دەگرێتەوە. هیگڵ لەنێو کتێبی(فەلسەفەی ماف)دا دەڵێت:" شەمشەمە کوێری مینرفا دەست بەهەڵفڕین ناکات، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کەتاریکی باڵدەکێشێت)(١١). وەکو ئەوەی ئێمەش دەزانین شەمشەمە کوێری مینرفا خواوەندی حیکمەتو فەلسەفە بووە لەلای ڕۆمانییەکاندا، هیگڵ-یش لێرەدا بەمانای فەلسەفە بەکاری دێنێت، فەلسەفە ئەو کاتە دێت کار دەکات کە بونیادی واقیعو ژیان بەتەواوی دامەزراوە. لەلای هیگڵ وادیارە فەلسەفە زیاد لەپێویست دوا دەکەوێت بۆ گەیشتن، چونکە فەلسەفە واتا هزری جیهانی، دەرناکەوێت، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە واقیعی کردارەکی کۆتایی دێتو کردەی پێشڤەچوونیشی تەواو دەکات. ئەوەش وا لەهیگڵ دەکات ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە هزری گشتگیر فێری وانەیەکمان دەکات، ئەو وانەیەی ئەم مێژووەش فێرمانی دەکات ئەوەیە: کاتێك واقیعی کردارەکی پێدەگات، تەنیا ئەو کاتە ئایدیای باڵا سەرهەڵدەداتو دەردەکەوێت، تاوەکو ڕوو بەڕووی

جیهانی واقیعی ببێتەوەو بۆخۆیشی لەوێنەی مەملەکەتێکی عەقڵیدا ئەو جیهانە واقیعییە بونیاد بنێت.

بەمجۆرە زانیمان بۆچی هیگڵ فەلسەفە بەهزری دووەم ناودەباتو چ کاتێکیش فەلسەفە دێت تاوەکو لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا کاری خۆی ئەنجام بدات. بەڵام بۆچی فەلسەفە لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بوونی هەیەو تایبەتمەندییەکی مرۆڤایەتییانەیە؟ لەبەرئەوەی بیرکردنەوە بەشێکە لەسروشتی خودی مرۆڤ، مرۆڤ تاکە بوونەوەرە خاوەنی یاساو ڕەوشتو ئایینە، بۆیە دەبینین بیرکردنەوە نەوەکو هەر بوونی هەیە، بگرە لەسەرجەم بوارەکانی ژیانیشدا زۆر چالاكو کاریگەرە، ئەم بیرکردنەوەیە دەمێك لەژێر ناوی هەستکردندایە، دەمێکیش بەئیمان ناوزەد دەکرێتو دەچێتە نێو پرۆسەی ئایینییەوە، ئا لەوێشەوە کاریگەریو کارلێکردنی دیارو ڕوونە، بەڵام دیارە لەلای هیگڵ جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەوەی کە تو بۆ خۆت خاوەنی ئەم هەستانە بیت کە هزر دروستیان دەکاتو موڵکدارێتیان بکەیت، لەگەڵ ئەوەی کە تۆ موڵکدارێتیان نەکەیت، بەڵکو تەنیا بیرۆکەیەکت لەسەریان هەبێت، چونکە ئەو هزرانەی بیرکردنەوەی دواتر یا دووەم بەم وێنەیە لەنێو وشیاریدا بەدیان دەکات، ئێمە لەژێر ناوی هزری ئاوەژووکار یا بەڵگەخوازی گشتی پۆلێنیان دەکەین، هەر ئەوەشە لەلای هیگڵ بەناوی فەلسەفە ناودێر دەکرێت. بوونی ئەم جیاوازییە لەنێوان هزر بەگشتیو هزری ئاوەژووکاری تایبەت بەفەلسەفە، بەپێی بۆچوونی هیگڵ بۆتە هۆی ئەوەی بەدحاڵیبوون بەرهەم بێت، چونکە زۆرجار دەگوترێت هزری ئاوەژووکار مەرجی سەرەکیو تاکە ڕێگایە بۆ گەیشتن بە وشیاریو یەقینی حەقی ئەزەلی، بۆ نموونە بەڵگە میتافیزیکییەکانی بوونی خوا وا ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێت وەکو ئەوەی زانینو بڕوا پێکردنیان تاکە شێوازی جەوهەرییە کەوامان لێدەکات بڕوا بەبوونی خوا بکەین، ئەوەش کارێکە وەکو ئەوە وایە بڵێین ئەستەمە بتوانین نان بخۆین، بەرلەوەی شارەزای تایبەتمەندییە کیمیاییو ڕووەکیو





ئاژەڵییەکانی خواردن ببین، بۆیە پێویستە لەسەرمان کردەی هەرسکردنی خواردن دوا بخەین بۆ دوای لێکۆڵینەوەمان لەتوێکاریو فسیۆلۆژیا. ئەگەر مەسەلەکە وابێت ئەوە ئەم زانستانەش وەکو فەلسەفە هەریەك لەبواری خۆیاندا زۆر قازانجو سودیان بەدەست دەهێنا، بەشێوەیەك نە دەکرا دەسبەرداریان بین. هیگڵ لەدرێژەی تێڕامانە فەلسەفییەکانی لەسەر هزری ئاوەژووکار یا هزری دووەم (فەلسەفە)، زۆر بەقووڵی ڕۆ دەچێتە نێو ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بەئیدراك کردنی وشیاریو مەزندەکردنی عەقڵی، بۆیە دەبینین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو ناوەڕۆکەی بەردەوام وشیاریمان خەریك دەکات، جا ئەم ناوەڕۆکە هەر جۆرو هەر شێوەیەك بێت، ئەم ناوەڕۆکەیە سروشتی چۆنایەتی هەستو ئیدراکی هەستی مەزندەو نمایندەکانمان پێکدەهێنێت، هەر ئەم ناوەڕۆکەشە سروشتی چۆنایەتی ئامانجو مەبەستو فرمانو بەخەیاڵداهاتنو هزری تۆتالیتاریمان پێکدەهێنێت، لەم لایەنەشەوە ئەوە هەستو ئیدراکی هەستیو...تاد ئەم شێوانەن کە لەناوەڕۆك وەریاندەگرێتو لەسەریان دەردەکەوێتو خۆی نمایش دەکات، بۆیە ئێمە ئەوە بەدی دەکەین کە لەلای هیگڵ ناوەڕۆکەکان هەرگیز ناگۆڕێنو هەر یەك شتن، جا ئێمە هەستیان پێبکەین یا هەستیان پێنەکەین، بیانبینین یا نەیانبینین، بمانەوێت یا نەمانەوێت، ئاوا بەسادەیی هەستیان پێبکەین یا بەشێوەیێکی ئاوێتەیی لەگەڵ کۆمەڵێك هزری تردا، لە هەر شێوەیەك لەم شێوانە یا لەم ئاوێتەیەدا ناوەڕۆکەکان دەبن بە بابەتی وشیاری، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ناوەڕۆکەکان بەم شێوەیە دەبن بە بابەتی وشیاری، ئەوە دیارە شێوە جۆراوجۆرو فرەکان لەگەڵ ناوەڕۆکدا یەك دەگرنەوە، ئەو کاتەش هەر شێوەیەك وا دیاردەکەوێت کە هەڵگری بابەتێکی تایبەتە. بەمجۆرە دەبینین ئەو شتەی لەبنەڕەتدا یەك شتە وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی فرەو جیاواز بێت(١١).

هیگڵ پێی وایە ئەم هەموو جۆرە جیاوازە لەهەستکردن و ئیدراکی هەستی و ویست، بەوڕادەیەی کەئاگاداری دەبین و هەستیان پێدەکەین

بەناوی هزر یا نمایندەی هزری ناویان دەبەین، بۆیە هیگڵ پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کەفەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی دێت هزرو گوتەکان دادەنێت و بەرهەمیان دێنێت، یا ئەگەر ووردتر بلێین فەلسەفە دێت هزری تۆتالیتاری دەخاتە شوێنی ئەونمایندە گشتیانەی ئێمە وا لێڕاهاتوین ناویان بنێین هزر.

بەم شێوەیە دەشێت ئێمە وابڕوانینە ئەم بۆچوونە زەینیانەی خستمانە ڕوو گوایە ئەوانە نموونەی خوازراوون لەسەر هزر یا هزری تۆتالیتاری، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین، ئێمە کاتێك خاوەنداریێتی ئەم وێناکردنانە دەکەین، واتا دەشێت ئێمە خاوەنی هزربین، بەڵام مەرج نییە ئیدراکی ئەوە بکەین کەئەم هزرانە هاو شێوەی چ بۆچوونێك و ئیدراکێکی هەستین، چونکە دیارە ئێمە بەردەوام کۆمەڵێك مەزندە کاری لە هەستەکانمانەوە وەردەگرین، هەموو مەزندەکانیش ناو دەنێین هزر، بەڵام جگە لەوانە کۆمەڵێك وێناکردن ومەزندەی تری تەواوو عەقڵی بوونیان هەیە وەکو(بوون، نەبوون، سەیرورەت، چەندایەتی، چۆنایەتی، یەك، زۆر.....تاد) هەموو ئەوانەش هزری تۆتالیتاری و گشتگیرن ، یاگوتەی عەقڵین، ئەوانەش لەلای هیگڵ بریتین لەهزری حەقیقی و فەلسەفەش کاریان لەسەر دەکات و لێیان دەکۆڵێتەوەو هەوڵدەدات وایان لێبکات شوێنی نمایندەی زەینی یا وێنا کردنی هەستی وەکو ئەوەی خستمانە ڕوو بگرنەوە.

## تێنەگەیشتن لە فەلسەفە

بوونی ئەم جیاوازییە لەنێوان ئیدراك و وێناکردنی مەزندەکان بەم جۆرەی خستمانە ڕوو، دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێك کەس لەکاری فەلسەفی حاڵی نەبن و تێنەگەن، کێشەی ئەو کەسانەش لەوە دایە کە ئەوانە توانای بیرکردنەوەی ئەبستراکتیان نییە، نەبوونی ئەم تواناکارییەش لەسروشتی





ئەو کەسانەدا نییە، لەبەر ئەوەی سروشتی مرۆڤ بۆخۆی ئاوایە، بەردەوام لەپێشقەچوندایە، بەڵکو نەبوونی تواناکاری پەیوەستە بەلێڕانەهاتن لەسەر ئەم شێوازەی بیرکردنەوە، واتا هەوڵنەدان بۆ گەیشتن بەهزری تەواو ئەبستراکت کراوو مەلەکردن لەنێو ئەم شەپۆلانەدا، ترس لەم مەلەکردنە وادەکات مرۆڤ تواناکاری پەیدا نەکات، ئەوەی هزرڤانانیش لەسایەی تواناکاری و ئازایەتی خۆیانەوە بەدەستی دێنن حاڵەتێکی جیاوازە، چونکە ئەوانە لەناخەوە تواناکاری ئەوەیان تێدایە لەنێو شەپۆڵە هزرییەکاندا مەلەبکەن، بەڵام وادیارە کە ئاڵۆزی و تەمومژاوی فەلسەفە، ئەوەش تۆمەتێکە بەردەوام دەخرێتە ئەستۆی فەلسەفەو فەلسەفەکاران، لە بنەڕەتدا بۆ دووفاکتەری سەرەکی دەگەڕێتەوە، یەکەمیان تەمبەڵی خەڵك تەمبەڵییەکی وا کە وایان لێدەکات بەشێوەیەکی سەرەڕۆیانە بەبێ لێکۆڵینەوەو وردبونەوەو سەرنج دان و شارەزاییی بڕیاری یەکلاکەرەوە بەسەر فەلسەفەدا بدەن، ئەوانە خۆیان بەوە ماندوو ناکەن بێن لەم زانستە گرنگە بکۆڵنەوە، بەڵکو بەیەکجار لەسایەی ئەم حوکم و تۆمەتانەوە خۆیان لەم پرۆسەیە دەدزنەوە، بەردەوامیش بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان لە فەلسەفە تێناگەن، ئەگەر چی عەقڵێشیان هەیەو مرۆڤی عاقلیشن.

فاکتەری دووەم مەسەلەیەکە کە لەخودی فەلسەفەدایە، فەلسەفە زانستێکە تایبەتەو سانا نییە دەسگیربکرێت، چونکە وا دەخوازێت مرۆڤ لەنێو پرۆسەیەکی بەردەوامی بالأبووندا بێت، لەجیهانی هەستی مەترياليیەوە بەرەوجیهانی بیرکردنەوەو تێڕامانی عەقڵی.

هیگڵ کاتێك ئەم مەسەلەیە دەخاتە ڕوو، ئاماژە بۆ شتێك دەکات کە پەیوەستە بەهەموومان، ئەویش ئەوەیە خەڵك بۆیە فەلسەفە بەتەمو مژاویو ئاڵۆزیو نادیاری تاوانبار دەکەن، لەبەرئەوەی ئەوانە گەرەکیانە ئەو شتانەی لەنێو عەقڵدا وەکو هزرێکی تۆتالیتاری هەستی پێدەکەن، بەشێوەیەکی عەینی لەبەرچاوی خۆیاندا بەدیان بکەن. واتا بە وێنەیەکی زەینییانە بەرجەستە بکرێن، بۆیە کاتێك داوا لەخەڵك دەکەین بیر لە





هزرێکی دیاریکراو بکەنەوە، ڕاستەوخۆ ئەم خەڵکە گلەیی ئەوەمان لێدەکەن کە ئەوان نازانن پێویستە لەسەریان بیر لەچی بکەنەوە! کەچی لەڕاستیدا هزر هیچ شتێکی تری تێدا نییە بۆ ئەوەی بیری لێبکرێتەوە، تەنیا خودی خۆی نەبێت. گلەیی خەڵك ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە ئەوان چەندە شەیدای ئەوەن مەزندەیەکی باو دەسگیر بکەن، ئەو کاتەش کە زەین ناچار دەکرێت هزرە باوەکانی خۆی بەکاربێنێت‌و هەنگاوێك بهاوێژێت بۆ ئەوەی لەهزری مەئلوف تێپەڕ بکات بەرەو هزری نامەئلوف، ئەوە ئەو کاتە ئەو کەسانە خودی خۆیان ون دەکەن‌و نازانن لەنێو نەخشەی زەیندا گەیشتوونەتە کوێ. ئێمە هەموومان ڕاستییەك دەزانین‌و درکی پێدەکەین، ئەویش ئەوەیە بیرکردنەوەو تێڕامانی فەلسەفی بیرکردنەوەو تێڕامانێکی نامەئلوف‌و جیاوازە، ئەوەش وامان لێدەکات ڕێز لەو کەسانە بگرین کە کاری هزری ئەنجام دەدەن‌و بەجۆرە مرۆڤێکی باڵایان بزانین لەسەرئاستی هزریدا. لەهەمان کاتیشدا تێڕوانینێکی دژکاریش بوونی هەیە، ئەم تێڕوانینە بۆ ئەوەی لەپلەو پایەی عەقڵ‌و تێڕامانی هزری‌و فەلسەفی کەم بکاتەوە، زۆرجار دێت هزرڤان‌و فەلسەفەکاران بەمرۆڤی ناواقیعی‌و یۆتۆپی‌و شێت ناودێر دەکات، لەم حاڵەتەشدا گەرەکییەتی قەرەبووی گرێی خۆ بە کەم زانینی خۆی بکاتەوە-کە هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە، دیارە جیاوازی بیرکردنەوەی فەلسەفی شتێکە پەیوەستە بەسروشتی بیرکردنەوەی فەلسەفی کەوا دەکات لەبیرکردنەوەی یەکەم یا بیرکردنەوەی ئاسایی جیاواز بێت. فەلسەفە بریتییە لەدابڕان‌و بازدان لە هەستپێکراوەوە بۆ هەست پێنەکراو، تواناکارییە لەسەر جێهێشتنی شتە مادی‌و مەتریالەکان‌و تێگەیشتنە لەمەسەلە عەقڵییە ئەپستراکت کراوەکان. ئەوە ئەو خاڵەیە کەوا لەخەڵك دەکات لەفەلسەفەو تێڕامان‌و بیرکردنەوەی فەلسەفی تێنەگەن، لەبەرئەوەی ناتوانن خودی خۆیان لەجیهانی هەستی دابماڵن، ئەوجیهانە هەستییەی بەرەو جیهانی عەقڵ پەلکێشیان دەکات. زەحمەتی مەسەلەکەش لەوەدایە مرۆڤ وەکو







سەرجەم گیاندارانی تر لەنێو شتە هەستپێکراوەکاندا لەدایك دەبێت‌و بەدرێژای تەمەنی منداڵیش لەنێویاندا گوم دەبێت، بەشێوەیەك لەتەمەنێکی دواتر سانا نییە بتوانێت خۆی لەم جیهانە دەرباز بکات، بەجۆرێك توانای بیرکردنەوەی ئەپستراکتی هەبێت، ئەوەش کردەیەکی زۆر قورس‌و زەحمەتە بۆ ئەو کەسەی بەردەوام وا لێڕاهاتووە لەنێو هەستپێکراوەکاندا گوزەران بکات. ئێمە بەردەوام قسە لەسەر ئەوشتانە دەکەین کە لەبەرچاوماندا هەن، قسە لەسەر خانوو ئامێری تەکنۆلۆژی‌و تەلەفزیۆن‌و ئۆتۆمۆبێل‌و شەقام‌و کەسانی تر دەکەین کە هەستیان پێدەکەین‌و بەڕاستی بوونیان هەیە، بەڵام زەحمەتە بیر لەبوون بکەینەوە!! زەحمەتە بتوانین بەشێوەیەکی ئەپستراکت بیر لەبوون یا بەگشتی گووتەی بوون بکەینەوە!! بوون وەکو ئەوەی بوونی هەیە، بوونێك کە بەهیچ شێوەیەك ناکرێت لەشتێك یاشتێکی تردا بەرجەستە بکرێت. ئێمە قسە لەسەر ئامادە نەبوونی کەسێك یا کۆمەڵێك یاشتێك دەکەین، قسە لەسەر نەبوونی شتێك یاشتێکی تر دەکەین، قسە لەسەر ونبوونی کەلوپەل‌و ئامێر دەکەین، بەڵام زەحمەتە لەسەرمان لەبیرۆکەی (نەبوون) تێبگەین، ئێمە بەردەوام دەتوانین قسە لەسەر کێش بکەین، بیرۆکەیەکمان لایە لەبارەی یەك کیلۆ، دوو کیلۆ....تاد، یەك تەن، دوو تەن .....تاد، دەتوانین قسە لەسەر ماوە بکەین، یەك مەترو دوو مەترو ....تاد، بەڵام ئاسان نییە لەبیرۆکەی (چەندایەتی ) تێبگەین. بەم جۆرە دیارە سانا نییە مرۆڤ بتوانێت جیهانی هەستی جیبێڵێت‌و بەرەو جیهانی ناهەستی یامیتا هەستی بڕوات، بەم شیوەیەش گەرەکمانە بەردەوام پۆشاکێکی هەستییانە بخەینە بەر بیرۆکە هزرییەکان، تاوەکو بە بەرجەستە کراوی بەدیان بکەین، بەڵام سروشتی بیرکردنەوەی فەلسەفی ئاوایە، مرۆڤ بۆ ئەوەی بە پڕۆسەی باڵابووندا بڕوات، لەجیهانی سروشتی هەستییەوە کە هەر لەقۆناغی منداڵییەوە دەست پیدەکات، بۆ ئەوەی بگات بەجیهانی هزرە ئەپستراکت کراوەکان، ئەوە دەبێت ئەم قۆناغانە تێپەڕ بکات‌و بیبڕێت.

مرۆڤی فەلسەفەکار ئەو کەسەیە ڕوو بەڕووی فرە جۆری هزرەکان دەبێتەوەو ڕێگاو دەریاکانی هزر تاقی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەنێو جیهانی ناهەستیشدا مەلە بکاتو ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە، بەڵام یەکەم شت کە پێویستە هزرڤان ئەنجامی بدات ئەوەیە، سەرەتا لەڕاستیو دروستی ئەو میتۆدە دڵنیا بێت کە لەسایەیەوە ڕۆدەچێتە نێو هزرو مەعریفە، بۆیە دەبینین هیگڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کاتێك مرۆڤی فەلسەفەکارو هزرڤان خۆی دەخاتە نێو دالأنەکانی هزرو فەلسەفەو خۆی لەسایەی ئەم بۆچوونانەوە لەلێواری مەسەلە ئایینییەکانیش دەخشێنێتو هەوڵدەدات بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێت، ئەو کاتە پێویستە لەسەری ئەوە بسەلمێنێت کەخودی فەلسەفەو ڕێبازی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی فەلسەفی دەتوانێت لەسایەی تێڕوانینو گۆشەنیگای تایبەتی خۆیەوە ئیدراکی ئەم بابەتانە بکاتو هەرسیان بکات، کاتێکیش جیاوازیو ناتەباییو دژکاری لەنێوان بابەتەکاندا سەرهەڵدەدات، واتە لەنێوان تێگەیشتنو بۆچوونی فەلسەفیو نێوان مەزندەو وێناکردنە ئایینییەکان، ئەو کاتە پێویستە لەسەری ئەو خاڵانە دەستنیشان بکات کە بوونەتە هۆی ناکۆکیو دژکاریو ڕاڤەیان بکات.

بۆ ئەوەی کەمێك وردترو ڕوونتر ڕۆبچینە نێو ئەوجیاکارییەی بەر لەکەمێك لەنێوان هزری یەکەمو هزری دووەمدا ئەنجامماندا، بۆ ئەوەی لەهەمان کاتیشدا وا لەخوێنەر بکەین ئیدراك بەوە بکات کە هیگڵ چۆن کاری لەسەر فەلسەفە کردووە، ئەوە واچاکە ئەم لێکدانەوەیەی هیگڵ بخەینە ڕوو.

هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بۆ ئەوەی ئێمە ئیدراك بەوە بکەین کە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی وشیاری ئێمە ڕەنگە بۆ یەکەمجار لەشێوەی ڕاستی خۆیدا دەربکەوێت، ئەو کاتەیە کە دەگۆڕێت بۆ وێنەیێکی هزری، بۆ بیرۆکەی عەقڵی گشتگیر، ئەو کاتەش هیگڵ دێت بۆ ئەوەی ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، پەنا دەباتە بەر بیرو بۆچوونێکی کۆن، ڕاو بۆچوونێك کە خودی خۆی ئەوە ئاشکرا دەکات کە لەسەر عەقڵ بونیاد







نەنراوە، ئەویش ئەم گووتەو بۆچوونەیە کە دەڵێت:" بۆ ئەوەی لە شتێك یا لە ڕووداوێکدا بگەیتە حەقیقەت، یا تەنانەت بگەیتە حەقیقەتی هەست یا ئیدراك کردن یا نمایندەی زەینی، ئەوە پێویستە لەسەرت بیری لێبکەیتەوە، بیرکردنەوە لەشتەکان بەلایەنی کەم واتا هەستەکانو هزرە باوەکانو.......تاد. بگۆڕین بۆ ئەوەی بیانکەین بەهزرو بیرۆکە"(١٣).

لەلای هیگڵ بایەخی فەلسەفە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە جیهانی حەقیقەت لەنێو فەلسەفەدا نیشتەجێیەو لەنێو فەلسەفەش دادەمەزرێت، ئێمەش لەسایەی پڕۆسەی هزری خۆمانو کارکردنمان بەشداری تێدا دەکەین، هەموو ئەوانەی لەنێو ژیاندان لەحەقو مەزنێتی خوایی لەدەسکردی بیرۆکە(هزر)ن، بابەتی فەلسەفەش دەسگیرکردنی هزرە لەشێوەی حەقیقیو هەمەکی خۆیدا، ئەوەش وا لەهیگڵ دەکات مەرجێك بۆ لێکۆڵینەوەی فەلسەفی دابنێت، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ حەقیقەتی خۆش بوێتو بڕوای بەهێزی ڕۆح هەبێت، ئەوەش چونکە مرۆڤ دەبێت لەو باوەڕەدا بێت ئەو وەکو مرۆڤ لەتوانای دایە بگاتە بەرزترین ئاستی حەقیقەتو ئەم حەقیقەتەش بدۆزێتەوە(١٤).

هەموو مرۆڤێکی ئاساییو ساغو سەلامەت خاوەنی ئامرازی بیرکردنەوەی ئاساییە، بیرکردنەوەش ئەوشتەیە فەلسەفە بانگەشەی بۆ دەکات، گوایە شێوەیەکی گونجاوی کاری ئەوە، بۆیە ئەوەی فەلسەفەکاریو هزرڤانی بکات، دەبێت دان بەجیاوازی تێڕوانین بۆ هزرکاریو فەلسەفەکاری دابنێت، چونکە ئەگەر ئێمە بڕوا بەم جیاوازییە نەکەین کە هیگڵ ئاماژەی پێداوە، ئەوە دیارە دووچاری وەهمێکی تر دەبینەوە، ئەو وەهمە دژو پێچەوانەی ئەو گلەییو گازاندانەیە کە تازە ئاماژەمان پێدا، گوایە ئاراستەی فەلسەفەو فەلسەفەکاران دەکرێت، ئەو گلەییەی پێی وایە فەلسەفە تەموومژاویو ئاڵۆزو نادیارو سەرلێشێواوکارە، بۆیە دەبینین هیگڵ دێت ئامۆژگاریمان دەکات کە دەبێت فەلسەفە زۆرجار بەرگەی هەندێك شت بگرێت، ئەوەی گوێ لەوخەڵکانە بگرێت کە بە هیچ شێوەیەك خۆیان بەوە ماندوو

نەکردووە تێی بگەن‌و لێی بکۆڵنەوەو لێی نزیك بکەونەوە، بەم شێوەیەش دێن بەبێ شارەزایی فەلسەفەکاری دەکەن‌و ڕەخنە لەفەلسەفە دەگرن، بەتایبەتیش ئەوانە زیاتر لەژێر کاریگەری هەست‌و سۆزی ئایینیدان، ئەوانە پێیان وایە شارەزابوون لەئایین بەتەنیا بەسە بۆ ئەوەی لەخودی فەلسەفەش تێبگەن، بەم شێوەیەش دەست دەخەنە نێو فەلسەفەو بەچەندین تۆمەتی ناڕەواو بێ بنچینە تاوانباری دەکەن.

کاری سەرەکی فەلسەفە ئەوەیە لەوشتانە بگات کە بوونیان هەیە، چونکە ئەوەی بوونی هەیە عەقڵە، کەواتە کاری فەلسەفە ئەوەیە وێناو مەزەندەی ئەو شتە بکات کە بوونی هەیە، ئەو شتەی کە بوونیشی هەیە هەرتەنیا خودی عەقڵە. ئەگەر بڕوانینە خودی خۆمان ئەوە دیارە هەریەکێك لەئێمە کوڕی سەردەمو زەمانی خۆیەتی، بەم شێوەیە فەلسەفەش نەوەی خودی سەردەمو زەمانی خۆیەتی، بەڵام لەنێو بیرۆکەیەکدا بەرجەستەکراوە. فەلسەفە نابێت جیهانێکی یۆتۆپی‌و وەهمی بونیاد بنێت، جیهانێك دووربێت لەواقیعی ژیانی کردارەکیانە، فەلسەفە بریتییە لەخودی ژیانی کردارەکییانەی واقیعی‌و دەربڕی ئەم ژیانەیە، بەڵام بەشێوەیەکی عەقڵییانە، ئەگەر واش بێت ئەوە کاری فەلسەفە ئەوەیە لەم هزرە بنەڕەتی‌و بنچینەییانە بکۆڵێتەوە کە بوونەتە کۆڵەگەو ڕایەڵی ژیانی کردارەکییانە بەشێوەیەك ئەم میحوەرە عەقڵییانە ئاشکرا دەکات کەخەڵك ڕەفتارو ئاکاری خۆیانیانی لەسەر بونیاد دەنێن، بەڵام بەبێ ئەوەی بزانن یاهەستی پێبکەن. ئەم بۆچوونەی هیگڵ‌یش بۆ فرمانی سەرەکی فەلسەفە دەڤاو دەق لەگەل بۆچوونی ئەرستۆ یەکدەگرێتەوە، لەگەڵ ئەو پێناسەیەی ئەرستۆ گوایە فەلسەفە لێکۆڵینەوەیە لەهۆکارە بەراییەکان(١٥).





# فەلسەفە چییە ؟

کارێکی سەختە مروڤ بێت قسە لەبارەی فەلسەفەو ناوەڕۆکی فەلسەفەو کاری فەلسەفە بکاتو هەوڵبدات ڕۆشناییان بخاتە سەرو ڕوونیان بکاتەوە، چاوخشاندنێك بەمێژووی دوورو درێژی فەلسەفەو فەلسەفەکاری ئەومەسەلەیەمان بۆ ئاشکرا دەکات، پرسیارێکی زۆر سادەو ساکارو ساناى وەکو(فەلسەفەچییە؟) بەدرێژایی چەندین سەدە تائێستاش وەڵامێکی ڕاستو ڕەوان‌و ڕەهای بۆ دەسگیر نەکراوە، بگرە ئەم پرسیارە نەوەکو هەر بەبێ وەڵامدانەوە ماوەتەوە، بەڵکو بۆتە هۆی نانەوەی دووبەرەکی‌و دژکاری‌و جیاوازی زۆریش. کاتێك هیگڵ دێت ئەم کارە ئەنجام دەدات، دیارە لەناخەوە دەزانێت ڕوو بەڕووی چ ئاستەنگێك بۆوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ فەلسەفەکارێکی ئاوامەزنە بەشێوەیەك ڕوو بەڕوو بوونەوەی لەم شێوەیە نایترسێنێت‌و دێت لەنێوئەم زۆنگاوەدا خەریکی ڕاوەماسی دەبێت. هیگڵ پێ لەسەرئەوە دادەگرێت کە پێویستە ئێمە والەفەلسەفە بگەین، یا بەشێوەیەکی تر والەناوەڕۆکی فەلسەفە تێبگەین کە بریتییە لەواقیعی کردارەکیانە، ئەوەش لەلای ئەو واتا جەوهەروناوەڕۆکی حەقیقەت، ئەو جەوهەرەی کە لەبنەڕەتدا بەرهەم هاتووەولەنێو چوارچێوەی ژیانی عەقڵیشدا بەردەوام خودی خۆی بەرهەم دێنێتەوە، بەشێوەیەك ئەو بۆخۆی بۆتە ئەوشتەی کە جیهانی ناوەکی‌و دەرەکی وشیاری پێکدەهێنێت، بەڵام ئالێرەدا مەبەستی هیگڵ چییە؟ مەبەستی لەواقیعی کردارەکیانە چییە؟ ئێمەش چۆن ئەم ناوەڕۆکە دەناسینەوە؟ دیارە وەڵام و ڕاڤەکردنەکەی هیگڵ بەم شێوەیەیە:ئێمە لەسایەی ئەزموونەوە دێین ئەم ناوەڕۆکە دەناسین، بەڵام خودی ئەزموونیش بەردەوام دەکشێت‌و چوارچێوەیەکی فراوانتر داگیر دەکات، ئەویش وجودی ناوەکی‌و وجودی





دەرەکییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەزموون ئەوەندە وشیاری دەبەخشێت کە بتوانرێت لەسایەیەوە جیاوازی بخاتە نێوان دیاری ڕووت، یا ئەو شتەی عەینیو بەرجەستەکراوە، ئەویش ئەو شتەبەرچاوو دیارو تێپەڕەیە کە بێمانایە، لەگەڵ ئەوشتەی کە دەکرێت بەناوی واقیعی کردارەکیانە ناوزەد بکرێت، بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین ئەو شتەی فەلسەفە لەشێوازەکانی تری گەیشتن بەمەعریفەی بوون جیا دەکاتەوە وێنەیە، بۆیە واپێویست دەکات فەلسەفە لەحاڵەتی خۆگونجاندندابێت لەگەڵ واقیعی کردارەکیانەو ئەزموونداو، لەواقیعیشدا دەشێت بەلایەنی کەم وابڕواندرێتە ئەم گونجانە کە ئەوە شێوازێکی دەرەکییە ئێمە لەسایەیەوە ڕادەی ڕاستی فەلسەفەیەکی پێ تاقی دەکەینەوە، بۆیە دەشێت بڵێین مەبەستی باڵاو کۆتایی زانستی فەلسەفی لەسایەی ئەم گونجاندنەدا گەیشتنە بەجۆرە یەکخستنێك لەنێوان خودی عەقڵی وشیاری بۆ خۆی، لەگەڵ ئەو عەقڵەی لەنێو جیهاندا بوونی هەیە، یا بەگوتەیەکی تر، هیگڵ زیاتر مەبەستی واقیعی کردارەکیانەیە، بۆیە بۆئەوەی زیاتر لەم بابەتە لەلای هیگڵ شارەزابین، واپێویست دەکات زیاتر فەلسەفەکاری لەسەر بۆچوونی هیگڵ بکەین سەبارەت بەهەریەك لەچەمکەکانی وەکو (واقیع، کردارەکیانە، مەعقوڵ، عەقڵ،......تاد ).

دەبینین هیگڵ لەکتێبی (فەلسەفەی ماف)دا دەڵێت:( هەرچی عەقڵانییە واقیعییەو، هەرچی واقیعییە عەقڵانییە)، ئەم گوتەیەی هیگڵ کاروکاردانەوەیەکی زۆری هەبوو لەنێو هزرڤانو فەلسەفەکاراندا، ئەم کاردانەوەیە لەلای هەندێکدا ئەنجامی بەدحاڵیبوونو بەهەڵە تێگەیشتن بوو لە بیرۆکەی هیگڵ و لێکدانەوە فەلسەفییەکانی، هەندێکی تریش نیاز خراپی بەدواوە بوو بەمەبەستی ئەوەی ئەم گوتەیە بەشێوەیەکی وا ڕاڤە بکرێت تاوەکو لەسایەیەوە هیگڵ-ی پێ تاوانبار بکرێتو ڕەخنەی ئاڕاستە بکرێت، بەڵام سەرچاوەی بەهەڵەداچوونو بەدحاڵیبوونەکە بۆ بەهەڵە تێگەیشتن لەوشەی (واقیع) دەگەڕێتەوە، چونکە زۆرجار لەلای هزرڤانان وا ڕاڤەکراوە گوایە مەبەستی واقیعی ئێستایە، یا ئەو شتەیە کە ئێستا لەبەر





چاوماندایەو ڕاستەوخۆ لە نێویدا گوزەران دەکەین، واتا بەشێوەیەك لەشێوەکان هیگڵ ئێمە بۆ ئەوە بانگەشە دەکات بێین ئەم واقیعە بپەرستینو ملی لەبەردا بنوێنین مادامەکی دەربڕی عەقڵە. د.ئیمام عبدالفتاح کاتێك دێت ئەم وشەیە لێکدەداتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە وشەی واقیعی بەزمانی ئەڵمانیدەکاتە(wirk lich)ئەم وشەیەش لەکردە یا کارکردن داتاشراوە(wirken_act)ئەوەش دەکاتە واقیعی کردارەکیانە، وەکو ئەوەی هیگڵ باسی لێوە دەکات، شتێکی نێگەتیڤی یا سروشتێکی پێدراونییە، بۆیە ئەوەی واقیعییە یا بەکردارەکیانە بەدەستهێنراوە بەردەوام ئەنجامی کردەیە یا کارێکە، بۆیە ئەوە پەرستنی واقیع نییە، بەڵکو کارکرنو چالاکییە بۆ ئەوەی عەقڵ بێتەدی. لەلایەکی تریشەوە د.ئیمام ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هیگڵ گوتەکەی خۆی بەم شێوەیە دەست پێنەکردووە وەکو ئەوەی ئەنگلس وەری گرتووەو باسی لێوە دەکات، واتا ئەنگلس بەهەڵە گوتەکەی هیگڵ-ی وەرگرتووە، دواتریش بەهەڵە ڕاڤەی کردووە، بەم شێوەیەش یارمەتی ئەوەیداوە کە بەهەڵەش بڵاوببێتەوە، ئەنگلس پێی وابووە هیگڵ گووتویەتی(هەرچی واقیعییە، ئەوە عەقڵییە)، کەچی لەڕاستیدا مەسەلەکە پێچەوانەیە، واتا هیگڵ گووتویەتی(هەرچی عەقڵییە، ئەوە واقیعییە)، لێرەشدا دیارە جیاوازی ئەم دووگوتەیەو ئەم دوو تێڕوانینەش چەندە زۆرە، بەپێی گوتەکەی هیگڵ دیارە ئەو دان بەعەقڵانییەتی واقیعەوە نانێت، بەڵکو گریمانی واقیعییەتی عەقڵانیو بەدیهاتنی کردارەکیانەی دەکات، واتا ئەوەی کە عەقڵییە لەناوەخۆیدا ئەوهێزە هەڵدەگرێت کە بەکردارەکیانە بێتەدی، یا بگۆڕێت لەهێزەوە بۆ کردار، لەبەرئەوەی عەقڵ بەتەنیا شتێك نییە لەسروشتی مرۆڤدابێت، بەڵکو عەقڵ هێزە، ئەو هێزەیە لەلای گریکەکان بەلۆگۆس یا نۆس ناسراو بووەو لەنێو جیهاندا دێتەدی، بەم شێوەیە کاتێك هیگڵ لەوە دڵنیابوو ئەوەی عەقڵی بێت بەردەوام سەرکەوتوو دەبێتو خۆی بەدی دێنێت، ئالەم





چرکەیەدا بەشی دووەمی گوتەکەی تەواو دەکات، ئەویش ئەوەیە واقیعیش عەقڵییە، ئەوەش ئەنجامێکی بەشی یەکەمی گوتەکەیەتی.

هیگڵ لەکتێبی (فەلسەفەی ماف)دا کاتێك گوتی:( هەرچی عەقڵییە ئەوە واقیعییە، هەرچی واقیعیشە ئەوە عەقڵییە) وەکو ئەوەی خستمانە ڕوو، دووچاری هەڵمەتێکی تووندوتیژی ڕەخنەیی بۆوە، کاتێکیش لەو کەسانە هاتە وەڵام ئەوەی خستە ڕوو کە ئەگەرچی ئەو لەوەڵامدانەوەدا پەنا ناباتە بەرعینایەتی خوایی کە بەڕوونی ئەم دووەمەسەلەیە لەخۆیەوە دەگرێت، بەلاّم بۆئەوەی دەلالەتی ئەم گوتەیەی خۆی ڕوون بکاتەوە، پێی وایە پێویستە ئێمە ئەو پرنسیپە بزانین کەخوا واقیعی باڵاو تاکە واقیعە، بوونیش لەئاست فۆرم لەبەشێکدا دیارەو لەبەشێکیشدا واقیعە، هەموو ڕووداوەکانی نێو ژیانی ئاسایی مرۆڤیش، هەموو بوونێکی تێپەڕ بەواقیعییەت دەناسرێت، لێرەدا ئەوجەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کاتێك دێت قسە لەسەر واقیع دەکات، ئەوە دەبوایە زۆر بەسانایی مرۆڤ بزانێت ئەو بەچ مانایەك ئەم دەربڕینەی بەکارهێناوە، لەبەرئەوەی خودی هیگڵ وەکو دیارە لەنێو کتێبی (لۆژیك)دا مەسەلەی واقیعی چارەسەرکردووەو ڕوونی کردۆتەوە، بەم شێوەیەش ئەو واقیعی تەنیا لەوشتە تێپەڕانە جیا نەکردۆتەوە کە بوونیان هەیە، بەڵکو بگرە لەکەینونەو کائینیشی جیا کردۆتەوە، لەوجودیشی جیاکردۆتەوە.

هیگڵ لەدرێژەی ڕاڤەکارییەکان و بەرپەرچدانەوەکەی خۆیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە زۆر ڕاوبۆچوون هەیە لەدژی واقیعی عەقڵ، ڕاوبۆچوون هەیە لەدژی واقیعییەتی عەقڵ وەکو حەقیقەتێکی واقیعی، بەلاّم ئەو پێی وایە خاوەنی ئەم ڕاوبۆچوونانە ئایدیاو هزری ئایدیالی وەکو ئایدیاییێکی باڵا بەدی ناکەن، بەڵکو لەو باوەڕەدان ئەم ئایدیایە باڵایە تەنیاو تەنیا بوونەوەرێکی خەیاڵیو خوڕافییە، فەلسەفەش، یا بەمانایەکی تر فەلسەفەی هیگڵ-یش، وابەدی دەکەن وەکو ئەوەی بەسیستەم کردن و ڕێکخستنی ئەم تارماییانە بێت(١٦).





ئەم گوتە سادەو ساکارو پڕبایەخو پڕمانایانە بوونە هۆی ئەوەی شەپۆلێك لەدژایەتیکردنو هەڵمەتی پڕوپاگەندەیی لەدژی هیگڵ دەست پێبکات، ئەوەتا هیگڵ ئاماژە بۆئەوە دەکات کە ئەم دژایەتیکردنە ئەو کەسو نێوەندانەشی گرتەوە کەوا دەڕواننە نائامادەگی ئایین بەپێی بۆچوونی هیگڵ، لەبەرئەوەی لای ئەو فەلسەفەو ئایین یەك شتن، ئەم نێوەندانە وادەڕواننە ئەم گوتانەی هیگڵ گوایە ئەوە بەشێوەیەك لەشێوەکان ڕیسوایيو سوکایەتیکردنە. لەبڕوا بوون بەوەی کە(هەرچی عەقڵییە ئەوە واقیعیشە، هەرچی واقیعیش بێت ئەوە عەقڵییە) مرۆڤی سادەو مرۆڤی فەلسەفەکار یەکدەگرنەوە، ئەوەش خاڵێ دەسپێکی کردەی فەلسەفییە لەتوێژینەوەی هیگڵ-دا بۆ جیهانی ڕۆحو جیهانی سروشتی، لەبەرئەوەی هەرجۆرە بیرکردنەوەیەك یا سۆزێك یا هەرشێوەیەك لەشێوەکانی وشیاری خودی ئەگەر وابڕوانێتە ئێستا گوایە شتێکی بەتاڵەو هەوڵبدات لەسایەی تێڕوانینێکی باڵاوە لێی تێپەڕ بکات، دیارە خۆی لەبۆشاییدا دەدۆزێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو بۆخۆی ئەوکاتە تەنیا لەنێو ئێستادا بوونی دەبێت، واتا ئەویش بۆش و بەتاڵو بێهودەیە، ئەگەر بیرۆکە، هزر گۆڕا بۆ(بیرۆکەیەك، هزرێك) واتا بوو بە بەشێك یا ڕایەك، ئەوە دیارە خودی فەلسەفەش ئەم بۆچوونو تێڕوانینە ڕەتدەکاتەوەو ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە هیچ شتێك بە کردارەکیانە بوونی نییە، تەنیا بیرۆکە(هزر) نەبێت، ئەگەر بڕواشمان بەوەکرد، ئەوە دیارە گرنگە ئەو شتە ئەبەدییە بناسین کە خۆی لەدواوەی ئێستاوە حەشار دەدات، واتا شتی ئەبەدی خۆی لەدواوەی دیاردە دەرەکییەکاندا حەشار دەدات(١٧).

هیگڵ کاتێك قسە لەسەر ئایینو خوا دەکات، پێی وایە خوا حەقیقەتێکی کردارەکیانەیە، بگرە لەوەش زیاتر، لەلای ئەو بێگەردترینو باڵاترین حەقیقەتی کردارەکیانەیە، واتا بەتەنیا خوا حەقیقەتی کردارەکیانەیە، بۆیە کاتێك وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە بەوە تاوانباری دەکەن گوایە ئەو لەسایەی ئەم گوتارانەیەوە فەلسەفەو هزر ڕیسوا دەکات، دێت قسە





لەسەر ئەوە دەکات کە خودی ئەو کەسانە ئەوەش دەزانن کە خوا جگە لەوەی حەقیقەتی کردارەکیانەیە، ئەوە لەلایەکی تریشەوەو لەلایەنی ناوەڕۆکی لۆژیکی مەسەلەکەوە، بوونی کردارەکیانە بۆخۆی تەنیاو تەنیا دیاردەیەکی بوونی حەقیقەتی کردارەکیانەن‌و تەنیا لەڕوویێك و لەلایەکی ترەوە واقیعی کردارەکیانەن، ئێمەش لەژیانی ڕۆژانەماندا ئەوە دەزانین هەر نەزوەیەك لەنەزوە خەیاڵییەکان، یا هەر هەڵەیەك، یا هەر شەڕانگێزییەك، بگرە هەرشتێك کە سروشتی شەڕانگێزی لەخۆیەوە بگرێت لەنێو وجوددا، ئەوە بەبێ وردبینی ناودەنرێت واقیعی کردارەکیانە.

هیگڵ بۆ ئەوەی مەسەلەکان ڕوونتر بکاتەوە، پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت پێویستە ڕەخنەگرەکانی زۆر بەوردی لەو مانایە ڕابمێنن کە ئەو تێیدا بەکاری هێناوە، بۆیە ئاماژە بەوە دەدات کە ئەو لەنێو لۆژیکدا بەدرێژی ئەم مەسەلەیەی باسکردووە. دڵنیێدانان بەواقیعییەتی عەقڵی دژکارە لەگەڵ وەهمێکی بەربلاو کە پێی وایە هزرونموونە باڵاکان تەنیاو تەنیا زیندە خەون‌و فەلسەفەش بەشێکە لەم زیندە خەونە، جگە لەوەش دژکارە لەگەڵ وەهمێکی تری جیاواز کە پێی وایە هزرو نموونە باڵاکان لەوە باڵاترن کە لەواقیعی کردارەکیانەدا بوونیان هەبێت، یا لەوە بێ تواناترن بتوانن بۆخۆیان ئەم واقیعییەتە بەدەست بێنن، بەڵام ئێمە زانیمان‌و لەگەڵ هیگڵ-یشدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت بابەتی فەلسەفە هزرە، هزریش بۆخۆی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی، بۆیە بابەتی فەلسەفە لەسایەی هزرەوە دەبێتە لێکۆڵینەوە لەواقیعی کردارەکیانە، ئەو واقیعە کردارەکیانەیە بابەتی کۆمەڵایەتی‌و مرۆڤایەتی بەرهەم دێنێت. بەم جۆرە دیارە هزری ئاوەژووکار یا تێڕامان‌و لێکدانەوەی هزری لەخودی شتەکان بەشێوەیەکی گشتی پرنسیپی فەلسەفەکاری لەناو خۆیدا دەگرێت، لێرەشدا هیگڵ دێت پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکات کە کاتێك ڕۆحی ئاوەژووکراو لەسەردەمە نوێیەکاندا، دوای سەردەمی چاکسازی لۆتەری، بۆخۆی بەتەنیاو بەدابڕاوی لەنێو جیهانی تایبەت بەخۆیدا نەمایەوە، وەکو ئەوەی لەلای





گریکەکاندا هەبوو، بەڵکو هاتووە ڕاستەوخۆ لەنێو ماددەیەکی بێ سنووردا دەستی بەچالاکی خۆی کردووە، ئەو مادەیەش دیارە لەلای هیگڵ جیهانی دیاردەکانە، بۆیە لەلای ئەو ناوی فەلسەفە بەسەر هەموو ئەوکایە مەعریفیانەدا سەپێنراوە کە ئەوەی خستۆتە ئەستۆی خۆی بگات بەپێوەرێك، بەهەمەکییەك لەنێو ئەم هەموو دەوروبەرەی پڕە لەڕووداوی تاکگەرای ئەزموونی، بۆ ئەوەی بگات بەتوخمی پێداویستی یا ئەو یاسایانەی لەنێو ئەم هەموو شڵەژانەدا هەیە، وادیارە فەلسەفەی نوێش لەلای ئەو ماددەکانی لەتێبینی‌و تێڕامانی کەسێتی ئێمە وەردەگرێت، ئەوە لەپاڵ ئیدراکی هەستیماندا بەهەردوو ڕووی دەرەکی‌و ناوەکیانەوە، ئەوە جگە لەسروشت و ڕۆح و دڵی مرۆڤیش، ئەم هەموو جەختکردنەی هیگڵ لەسەرئەزموون بەرەو ئەوەی ئاراستە دەکات بگاتە ئەو باوەڕەی پرنسیپی ئەزموونگەرایی دەتوانێت مەرجێکی زۆر گرنگ بۆ پەیداکردنی مەعریفە بەدی بێنێت، ئەویش ئەوەیە ئێمە دەبێت پەیوەندیمان لەگەڵ ڕووداوەکاندا هەبێت، تاوەکو بتوانین بڕوایان پێبکەین و قبوڵیان بکەین، یا ڕەتیان بکەینەوە، ئەگەر ڕوونتر قسە بکەین، دەبێت بڵێین ئێمە لەنێو ڕووداو ودیاردەکاندا دەبێت بەدوای پەیوەندیەکاندا بگەڕێین، پەیوەندی و یەکێتی لەگەڵ یەقینی خودی خۆماندا، پێویستە ڕاستەوخۆ پەیوەستی بابەتەکەمان بین، جا ئەم پەیوەستبوونە لەڕێگای هەستەوەرە دەرەکیەکانەوە بێت، یا لەسایەی عەقڵ و وشیاری خودی قوڵایی ناوەوەی خۆمان بێت، ئەو پرنیسپەشە لەلای هیگڵ ئێمە بەردەوام لەژێر ناوی بڕواپێکردن و مەعریفەی ڕاستەوخۆ، یا سروشتی لەجیهانی دەرەکی‌و بەرلەهەموو شتێکیش لەنێو دڵی خۆماندا بەدیان دەکەین، بۆیە ئەو زانستانەی بەناوی فەلسەفە ناونراون، هیگڵ ناویان دەنێت زانستە ئەزموونگەرییەکان، لەبەرئەوەی ئەم زانستانە خاڵی دەسپێکیان لەئەزموونەوە دەست پێدەکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئەنجامە جەوهەریانەی

ئەم زانستانە گەرەکیانە دەسگیریان بکەن بریتین لە: یاساکان، مەسەلە گشتییەکان، ئەو تیۆرانەی پەیوەستن بەوشتانەی بوونیان هەیە.

بەپێی ئەم بنچینەیەش دەبینین نیوتن ناو لەزانستی سروشتی لای خۆی دەنێت فەلسەفەی سروشت، لەگەڵ ئەوەی دابڕانی سروشتزانی لەفەلسەفە هەرلەسەردەستی خودی خۆیەوە بوو، نیوتن بەردەوام وشەی فەلسەفەی بەکاردەهێناو خودی خۆشی بەفەلسەفەکار ناودەبرد، بگرە لەوەش زیاتر ئەو کتێبەی خۆی نووسیبوی بەناوی میکانیك هەر بۆخۆی ناوی نابوو (پرنسیپە ماتماتیکییەکانی فەلسەفەی سروشتی) لەلایەکی تریشەوە دەبینین گرۆتیۆس(١٥٨٣-١٦٤٥ ) کاتێك کتێبێکی نووسی بەناوی (لەیاسای جەنگو ئاشتی)دا، هات هەندێك پرنسیپی گشتیو تیۆری گشتی دارشت سەبارەت بەپێوەندییە نێودەوڵەتییەکانو ئەو پرنسیپە سیاسییە ئەخلاقیانەی حوکم لەم پێوەندیانە دەکەن، خودی ئەم کتێبە بەیەکەم دەق دادەنرێت کە بەوردی دەستنیشانی یاسای نێودەوڵەتی دەکات، لەسایەی ئەم کتێبەوە گرۆتیۆس توانی تیۆرێك دابڕێژێت کە دەشێت ناوبنرێت فەلسەفەی یاسای نێودەوڵەتی. کاتێکیش دێت وڵاتەکان پۆلێن دەکاتو بەراوردیان دەکات، هاتووە میتۆدی بەڵگەخوازی بەکارهێناوە، ئەگەر ئێمە بیێن بەوردی لەشێوازی بەکاهێنانی وشەی فەلسەفە بکۆڵینەوە، ئەوە دیارە دەگەینەئەنجامێکی سەرنج ڕاکێش، ئەویش ئەوەیە ئەمڕۆ وادیارە هەموو زانستێك و بابەتێك بۆتە خاوەنی فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی، واتا تێڕامان لەناوەڕۆك و جەوهەری زانستی ئەم بابەتانەو هزرکاری سەبارەت بەبەڵگەکان و میتۆدی لێکۆڵینەوەیان بەفەلسەفە ناودێر دەکرێت، بۆیە بەردەوام ڕوو بەڕووی گوتەی وەکو(فەلسەفەی ئابووری، فەلسەفەی ژیان، فەلسەفەی شیعر، فەلسەفەی هێز، فەلسەفەی دەوڵەت، فەلسەفەی سیاسی،.....تاد) دەبینەوە، ئەو مەعریفە ئەزموونگەراییەی هیگڵ قسەی لەبارەیەوە دەکات دەتوانێت لەبواری تایبەتی خۆیداو لەسەرەتادا ڕازیکەر بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ دێت قسە لەسەرئەوە دەکات گوایە





سەرەڕای ئەوەش، بەڵام ئەو دەتوانێت لە دوو گۆشەنیگاو ڕەهەندەوە کەمتەرخەمییەکانی بەدی بکات، لەلایەك مەسەلەکە پەیوەستە بەچوارچێوەی ئەم بابەتانەی ناچنە ناو ئەم مەعریفە ئەزموونگەراییە، واتا ئێمە ناتوانین بەشێوەیەکی ئەزموونکراوی بەدیان بکەین و لێیان بکۆڵینەوە، بابەتەکانیش ئەمانەن(ئازادی، ڕۆح، خوا)، ئەم بابەتانە دەچنە خانەیەکی جیاواز، لەبەرئەوە نا کە پێوەندیان بەئەزموونەوە نییە، بەڵکو لەبەرئەوەی خودی ئەم بابەتانە دەچنە خانەی نا موتەناهی، لێرەدا هیگڵ دێت ئاماژە بەگوتەیەکی ئەرستۆ دەکاتو پێ لەسەرئەوە دادەگرێت کە ئەم گوتەیە بەهەڵەخراوەتە نێو گوتەکانی ئەرستۆ گوایە دەربڕی فەلسەفەکەیەتی، گوتەکە دەڵێت:( هیچ شتێك لەنێو عەقڵدا نییە ئەگەر پێشتر هەستی پێ نەکرابێت یا ئەزموون نەکرابێت)(١٨). لێرەدا هیگڵ دێت گوتەیەکی تریش دەهێنێتەوەو دەڵێت:( هیچ شتێك لەنێو هەستەکاندا نییە بەبێ ئەوەی بەعەقڵدا تێپەڕنەبێت) دواتریش دێت مانای ئەم گوتەیەی دواتر ڕاڤەدەکات. لەلای ئەو مانای دیارو ئاشکرای ئەم گوتەیە ئەوەیە (نۆس) یا (ڕۆح) هۆکاری جیهانین، بەمانای تایبەتیش بەرەو ئەوە دەچێت کە هەستکردن بەحەقو ئەخلاقو ئایین هەستێکی وان بەشێوەیەك لەشێوەکان ئەزموونیشنو تەنیا لەهزرەوە هەڵدەقووڵێنو لەسەر بنەمای ئەویش دێنە بوون.

مامۆستا عبدالفتاح الدیدی پێی وایە هیگڵ لەکاری فەلسەفی خۆیدا دوو پرنسیپی ڕەچاوکردووەو بەپێی ئەم دوو پرنسیپەش کاری کردووە، یەکەمیان ئەوەیە هەموو فەلسەفەیەك پەیوەستە بەواقیعی ژیانی کردارەکیانەی ئەو سەردەمەی تێیدا سەرهەڵدەداتو نەوەی ئەم ڕۆژگارانەیە، چونکە لەواقیعدا فەلسەفە گەڕانەوەو کارکردنە بۆ ئەزموونی مرۆڤایەتیو بەخشینی مۆرکێکی هزریانەیە بەم کردەوەو ئەزموونانە. دووەمیان ئەوەیە هەموو فەلسەفەیەك لەژیاندا دەبێت بەم ڕۆڵە هەڵبستێت کە خودی ژیان پێی هەڵدەستێت، ژیانیش لەجەوهەری خۆیدا بریتییە لە

سەیرورەت، سەیرورەتیش واتا ڕەتکردنەوەی پێشینەیی هەموو شێوەیەکی هزری دیاریکراو(١٩).

فەلسەفەش کاتێك بەم جۆرە خۆی پەیوەستی سەیرورەت دەکات، مەبەستی ئەوەیە بزاڤ و جوڵە ببەخشێتە ژیان لەپێناو ئاڵوگۆڕکردنی ڕاو بۆچوونو بەلاوەنانی سەلەفییەتو نۆستالیژییەتو جێگیر کردنی نوێگەریو هزرو فەلسەفەی نوێ، بەشێوەیەك نوێگەری ببێتە کارێکی سەرەکی لەنێو پرۆسەی ژیانی ڕۆژانەدا.

بەڵام با ئێمە لەگەڵ خودی مامۆستا دیدی بپرسین، باشە چۆن هیگڵ توانی ئەم دوو پرنسیپە سەرەکییە بخاتە واری کرداریو لەنێو یەکە یەکە قۆناغە فەلسەفیو هزرییەکانی خۆیدا پراکتیکیان بکات؟ دیارە ئەم شێوازی کارکردنە، ئەم بیرو بۆچوونەیە ئەم مەزنایەتییەو گەورەییەی بەخشیوەتە هیگڵ و فەلسەفەکەی، چونکە هیگڵ هات فەلسەفەی خستە نێو نێوەندی ژیانی عەقڵیو کردی بەپرنسیپی سەرەکیو هەوڵیدا لەخودی ژیانی عەقڵییەوە پرنسیپی هزری فەلسەفی بەدەست بێنێت، ئەوەی هیگڵ لەنێو کارو پرۆسەی فەلسەفیدا ئەنجامیدا گۆڕانێکی گەورەی شۆڕشگێڕانەبوو، ئەوەندە زیرەکانەش ئەم گۆڕانەی ئەنجامدا بەشێوەیەك توانی خۆی لەهەموو بەریەککەوتنێك دەرباز بکات، بەریەککەوتن لەگەڵ پیاوانی ئایین وکلێسا، بەریەککەوتن لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی، بەریەککەوتن لەگەڵ جەماوەر.

## ئەزموونگەراییو تیۆر

لەلای هیگڵ ئەزموونگەرایی دووکەم و کوڕی و کەمتەرخەمی لەخۆیەوە دەگرێت، یەکەمیان پەیوەستە بەپرنسیپی گشتی وەکو ڕەگەز یاجور یا.....تاد، خودی ئەم پرنسیپانە بۆ خۆیان دیارو ئاشکرانین، واتا وردەکاری





نین، چونکە ئێمە تەنیا قسە لەسەر ڕەگەز یاجۆرێك دەکەینو ناچینە ناوەوەی ئەم ڕەگەزو جۆرانە، بۆیە ئەم پرنسیپە پەیوەست نییە بەشتی جوزئیی یا ئەو شتە وردەکارییانەی ناوەوەیان، ئەوەش هەمان حاڵی وەقائیعی جوزئییە کە لەنێو یەکەیەکدا کۆبوونەتەوە، هەر یەکێك لەئاست ئەویتردا دەرەکیو لاوەکییە. دووەم خاڵ ئەوەیە ئەو سەرەتایانەی ئەم میتۆدە لێیەوە دەست پێدەکات لەهەموو بارو حاڵەتێکدا پێدراوێکی بەدیهینو ڕاڤەکراوو هەڵهێنجراو نین.

ئەم دوو خاڵەی کەموکوڕی لەنێو زانستی ئەزموونگەراییدا دەبنە هۆی ئەوەی لەنێو ئەزموونگەراییدا وێنەی پێداویستی بوونی نەبێت، ئالێرەوەیە هزری ئاوەژووکار کاتێك هەوڵدەدات ئەم کەمووکوڕییانە چارەسەر بکات، ڕاستەوخۆ دەگۆڕێت بۆ هزرێکی تیۆری، هزری تیۆریش هزرێکی تایبەتەو لەگەڵ بیرکردنەوەو تێڕامانی فەلسەفی دەگونجێت، لەبەرئەوەی ئەم هزرە هزرێکی ئاوەژووکارە ئەوە لەسروشتی گشتیدا هاوبەشە لەگەڵ هزری ئاوەژووکاریدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێك لایەنی ترەوە جیاوازە لێی، چونکە هزری فەلسەفی لەپاڵ وێنەی هاوبەشدا خاوەنی وێنەی تایبەت بەخۆیەتی، هیگڵ-یش پێی وایە ئێمە دەتوانین هزری گشتگیر وەکو نموونەیەك بهێنینەوە. دواتر دێت، پێوەندی نێوان زانستی تیۆری و زانستەکانی تر وا لێکدەداتەوە گوایە زانستی تیۆری بەلایەنی کەم ئەو وەقائیعە ئەزموونکارییانەی نێو زانستەکان بەلاوەنانێت، بەڵکو دێت دەیانناسێتو بەکاریان دێنێت، لەم کارەشدا مەبەستی ئەوەیە لەنێو بونیادی ئەم زانستانەدا توخمە هەمەکییەکان بدۆزێتەوە، توخمە هەمەکییەکانیش لای هیگڵ مەبەست لەیاسای ئەم زانستانەیە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زانستی تیۆری لەکاتی کارکردنیدا دێت گوتەی نوێتر دەخاتە نێو گوتە زانستییەکانو سیفەتی بڵاوبوونەوەو بەکارهێنانیان پێدەبەخشێت، ئالێرەشدا جیاوازی لەنێوان زانستی تیۆریو زانستەکانی تر تەنیا لەگۆڕینی گوتەکاندایە. کاتێك هیگڵ گەرەکیەتی ئەم مەسەلەیە زیاتر

ڕوون بکاتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لۆژیکی تیۆری هەموو گوتە بەراییەکانی تری لۆژیك‌و میتافیزیکای تێدایەو لەخۆیانەوەیان دەگرێت، کەواتە دیارە لەپاڵ پاراستنی سەرجەم یاساو بابەتەکاندا، دێت هەمان وێنەی هزریش دەپارێزێت، لەهەمان کاتیشدا دێت ئەم گوتانە بەشێوەیەکی فراوانتر دادەڕێژێت‌و پێشکەشیان دەبات، هیگڵ پێی وایە ئەگەر ئێمە بێین وەسفی ئەو کێشەیە بکەین کە فەلسەفە لێی دەکۆڵێتەوە، ئەوە دەشێت بڵێین فەلسەفە بریتییە لەڕاڤەکردنی گەردوون، ڕاستە کێشە فەلسەفییەکان فرە جیاوازن، کێشەی وەکو ئەخلاق‌و میتافیزیکاو ئێستاتیکاو ئەپستمۆلۆژیاو....تاد، بەڵام ڕاڤەکردنی گەردوون چارەسەرکردنی هەموو ئەم کێشانە لەناوە خۆیەوە دەگرێت(٢٠).

دواتر هیگڵ دێت وشیارمان دەکاتەوە لەوەی ئێمە لەکاتی خوێندنی فەلسەفەدا دەبێت جیاوازی بخەینە نێوان هزری گشتگیر-تۆتالیتاری-بەمانا تیۆرییەکەی، لەگەڵ ئەو شتەی بەردەوام ناوی هزری لێدەنرێت، بۆیە پێی وایە ئەم گوتەیەی کە دەڵێت شتی موتەناهی ناکرێت لەسایەی هزرەکانەوە ئیدراك بکرێت، گوتەیەکە هەزاران جار دووبارە کراوەتەوەو لەسەر بنچینەی تێڕامانێکی سەقەت بۆ مانای هزر بونیادنراوە.

د.زەکەریا ئیبراهیم دەگاتە ئەو باوەڕەی هیگڵ لەکتێبی (ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان)دا بەتایبەتیش لەبەشی یەکەمدا، کاتێك باسی فەلسەفە دەکات، دەسبەرداری کێشەی ئایینی نابێت‌و بەلاوەی نانێت، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە دێت هزری ئایینی خۆی بەشێوەیەکی مەزهەبییانەی ئەپستراکت کراو نمایش دەکات‌و دەخاتە ڕوو، ڕەنگە مەبەستی سەرەکیش ئەوە بێت بڵێت ڕۆح تاکە حەقیقەتی باڵایە(٢١). ئەو هزرەی گریمانی دەکەین گوایە دەشێت ببێتە ئامرازی مەعریفەی فەلسەفی، دەبینین بۆ خۆی لەلای هیگڵ پێویستی بەڕاڤەکردنێکی قووڵتر و زیاتر هەیە، چونکە دەبێت ئێمە لەوە حاڵی بین کە بەچ مانایەك پێداویستی یا تواناکاری لەسەر ڕازیکردن لەخۆیەوە دەگرێت‌و کاتێك یەکێك بانگەشەی





ئەوە دەکات گوایە دەتوانێت ئیدراکی بابەتی ڕەها بکات-مەبەستی هیگڵ(خوا، ڕۆح، ئازاد)یە. ئەوە پێویستە لەسەری بەڵگەمان بۆ بێنێتەوە، بەڵگە لەسەر ڕاستی بانگەشەکەی، بەڵام ئێمە کاتێك لەگەڵ هیگڵ سەرنج دەدەین، دەبینین خودی ئەم ڕاڤەکردنە وانەیەکی فەلسەفییە، وانەیەکە لەوانە فەلسەفییەکان‌و دەچێتە نێو خودی زانستی فەلسەفەش، بەم شێوەیەش بێت هەر هەوڵ و کۆششێك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە هەوڵ و کۆششێکی نافەلسەفییە، چونکە لەکۆمەڵێك گریمان‌و بانگەشەکردن‌و ئەنجام پێکدێت، هەندێك لەم ئەنجامانەش پاڵپشتن‌و هەندێکیش دژکارن، واتا دەبن بەئەنجامی دوگماو ناتوانن ڕازیمان بکەن لەئاست ئەوئەنجامەی پێویستە عەقڵ دانیان پێدابنێت.

فەلسەفەی ڕەخنەیی بەردەوام داوامان لێدەکات بەرلەوەی دەست بەگەڕان‌و سوڕان بکەین لەخوا یا لەوجودی حەقیقەتی شتەکان، پێویستە لەسەرمان کەمێك لەسەرەخۆبین، بەرلەهەموو شتێکیش داوا دەکات ئێمە لەئامرازی بەدەستهێنانی مەعریفە بکۆڵینەوەو ئەم ئامرازە بپشکنین‌و بزانین ئایا لەتوانایدایە کردەی مەعریفی ئەنجام بدات، یا ناتوانێت‌و کارێکی ئەستەمە، ئەوەتا کانت بەم شێوەیە ئامۆژگاریمان دەکات، چونکە ئەویش داوا دەکات ئێمە بەرلەوەی دەست بەکارکردن بکەین دەبێت ئامرازی کارکردن بپشکنین‌و بزانین ئایا دەتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات کە گەرەکمانە پێی ئەنجام بدەین، چونکە دواتر ئەگەر ئەم ئامرازە گونجاووباش نەبێت، ئەوە دیارە هەموو ماندووبوونمان بەفیڕۆ دەڕوات. ئەم بۆچوونەی کانت بەشێوەیەکی فراوان قبووڵکرا، وەکو ئەنجامێکی ئەم بۆچوونەش مەعریفە گەڕایەوە سەر خودی خۆی‌و کاری لەسەر خودی خۆی کرد، لەبری ئەوەی بایەخ بە بابەتەکانی خۆی بدات‌و لێیان بکۆڵێتەوە، بەم جۆرە هات لەخۆی کۆڵییەوە، واتا گەڕایەوە سەر مەسەلەی وێنە.

لێرەدا دەبێت بپرسین: باشە چۆن دەکرێت ئامرازی مەعریفە(عەقڵ)بپشکنین؟ مەبەست لەپشکنین چییە؟ ئایا پشکنینی ئامرازی مەعریفە بەدەستهێنان لەسایەی کردەیەك لەکردە مەعریفییەکانی هەمان ئامرازی مەعریفە بەدەستهێنانەوە نابێت؟ ئایا پشکنینی ئامرازی مەعریفە بۆ خۆی مەعریفە نییە؟ ئەوانە پرسیاری زۆر ماقووڵن، وەڵامەکانیشیان دیارو ئاشکرایە بەشێوەیەك پێویست بەڕونکردنەوەش ناکات.

د.زەکەریا ئیبراهیم کاتێك قسە لەسەر فەلسەفەی هیگڵ دەکات، پرسیارێك دەوروژێنێت، ئەویش ئەوەیە ئایا فەلسەفەی هیگڵ لەباوەشی فەلسەفەی کانت-دا گەشەی کردووە؟ ئایا ئێمە دەتوانین هیگڵ بەقوتابییەکی کانت دابنێین؟ لەڕاستیدا ئەگەر چاوێك بەو نامانەدا بگێڕینەوە کە هیگڵ بۆ شلینگ-ی هاوڕێی ناردووە، دەبینین هیگڵ چەندە بەمەزنییەوە دەڕوانێتە ئەو کارانەی کانت ئەنجامی داون، چونکە بەتێڕوانینی هیگڵ، کانت توانی تیۆری مەعریفە وا لێبکات لەبنەڕەتدا لەسەر خود بووەستێت نەوەکو بابەت، واتا ئەپستمۆلۆژیا پەیوەستە بەخودی مرۆڤ نەوەکو بابەتەکان، هەر بۆیەش دەڵێت:( پێشبینی ئەوە دەکەم مەزهەبەکەی کانت دوای تەواو کردنی پێشڤەچوون‌و باڵابوونی بەباشترین شێوە، شۆڕشێکی مەزن لەئەڵمانیا ئەنجام بدات، شۆڕشێك خاڵی دەسپێکی ئەم پرنسیپانە بێت کەتا ئێستا دانراون، بۆ ئەوەی بۆ پێشڤەی ببات‌و بەشێوەیەکی هەمەکییانە ڕەنگرێژی بکات، ئەوەش وەکو دەسپێکێك بۆ کارکردن‌و پراکتیك کردنی بەسەر هەموو ئەو مەعریفەیەی کە ئێستا بوونی هەیە)(٢٢).

ئەگەر وردتر بڕوانینە ئەو کتێبەی هیگڵ کە بەناوی(ژیانی مەسیح)ە و بڕوانینە ئەو بۆچوونانەی لەسەر کەسایەتی حەزرەتی مەسیح و گفتوگۆو دیالۆگەکانی‌و دواتریش لەخاچدانی، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو تاچەند لەژێر کاریگەری ئەو وێنەیەدا بووە کە خودی کانت پێشووتر





سەبارەت بەحەزرەتی مەسیح کێشاویەتی‌و وێنای کردبوو لەکتێبی(ئایین لە سنووری عەقڵی پەتیدا) خستبوویە روو، ئەم وێناندنەی هیگڵ بۆ کەسایەتی مەسیح زۆر هاوشێوەو لێکچووە لەگەڵ وێنەکەی کانت-دا.

هیگڵ لەکتێبی (لۆژیکزانی)دا دەنووسێت:( فەلسەفەی کانت ئەو ڕایەڵەیە کە فەلسەفەی نوێی ئەڵمانی لەسەر بوونیادنراوە، ئەوە خاڵی دەسپێکردنە)( ٢٣). دیارە هیگڵ پێی وابووە کانت دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئایدیالیزمی نوێ بووە، بۆیە بەشێوەیەك لەشێوەکان پێی وابووە باوکی ڕۆحی ئایدیالیزمی ڕەهای خۆیەتی، ئەوەش وا دەکات هیگڵ لەنێو کتێبی(ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان)دا ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ئەو پرنسیپەی(سەربەخۆیی عەقڵ)وەکو ئەوەی فەلسەفەی کانت ئاماژەی بۆ دەکات، ئەو پرنسیپە گشتییەیە کە دەبێت سەرجەم فەلسەفەی لەسەر بونیادبنرێت.

مرۆڤ دەتوانێت ئەو پێداویستییانە بخاتە ڕوو کەوا دەکەن فەلسەفەو بوونی فەلسەفەکار ببن بەپێداویستی، ئەوەتا هیگڵ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە ڕۆح ئەو کاتە هەستپێکراوە یا بەشێوەیەکی هەستیانە ئیدراکی پێدەکرێت کاتێك بابەتی خۆی لەنێو شتێکی هەستپێکراودا دەدۆزێتەوە، کاتێك خەیاڵ دەکات بابەتی خۆی لەسایەی وێنە یا نمایندەیەکدا دەدوزێتەوە، کاتێك گەرەکییەتی ئەوە بابەتی خۆی لەمەبەستێك یا ئامانجێکدا دەدۆزێتەوە، بەڵام لەبەرانبەر ئەم شێوەو بابەتانەی بوونی ڕۆح ئەوە ئێمە دەبینین لەسەر ڕۆح پێویستە ژیانی باڵاو قووڵی ناوەوەی خۆیشی تێر بکات ئەویش هزرە، چونکە لەلای هیگڵ قووڵترین شت لەنێو خود بریتییە لەهزر، بەم جۆرە ڕۆح دێت هزر دەکات بەبابەتی خۆی، لەسایەی ئەم کردارەشەوە ڕۆح بەرەو خودی خۆی دەگەڕێتەوە، لەبەرئەوەی خودی هزر بۆخۆی پرنسیپ‌و دەسپێکی ئەوە، خودی هزر بریتییە لەخودی پاك‌و بێگەردی ڕۆح. لەکاتێکدا کە ئەوە ڕوودەدات، دەبینین خودی هزر بۆ خۆی کەوتۆتە نێو تۆڕی دژکاری،

مەبەستی هیگڵ لێرەدا ئەوەیە لەنێو هزری توونودتیژدا ون دەبێت، ئەم هزرە توونددو تیژانە هەمان هزری خۆی نییە، بەم شێوەیەش دەبینین دژکارەکەی خۆی دەسگیر دەکات، لەبری ئەوەی بگات بەخودی خۆی.

هزر بەسروشتیخۆی دیالیکتیکییە، ئەگەر ویستیشمان ئیدراك بەوە بکەین‌و بزانین چۆن لەنێو خودی خۆیدا دووچاری دژکاری دەبێتەوە، ئەوەش بابەتێکی سەرەکییە لەبابەتەکانی لۆژیك، ئەو کاتەی هزر هیوای ئەوە لەدەست دەدات بتوانێت لەسایەی شێوازە تایبەتییەکانی خۆیدا بگاتە چارەسەرێك بۆ ئەو دژکاریانەی بۆ خۆی لەسایەی چالاکی خۆیەوە بەرهەمی هێناوە، ئەوە دیارە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە، بەرەو ئەو چارەسەریانەی تێیدا رۆح لەسایەیانەوە فێری ئەوە بووە دڵنەواییان لێ بەدەست بێنێت، ئەم پاشەکشەیەی هزر تەنیا لەڕۆژگاری هیگڵ- دا نەبووە، بگرە بەتەنیا لەڕۆژگاری ئێمەشدا نییە، بەڵکو دیارە پەیوەستە بەمێژووی مرۆڤایەتی‌و سەرجەم کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان، ئەوەتا هیگڵ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خودی ئەفلاتون-یش دەرکی بەم مەسەلەیە کردووەو ئاماژەی پێداوە، لەبەرئەوەی ئەفلاتون لەنێو دیالۆگی فیدۆن-دا چەندین لاپەڕە بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان دەکات، قسە لەسەر ئەو دژایەتی‌و ڕقەی خەڵك دەکات کە ئاڕاستەی لۆژیك‌و بەڵگەخوازی عەقڵی کراوە، ئەفلاتون پێی وابووە ترسناکترین شت ئەوەیە لۆژیك وامان لێبکات دەسبەرداری بین، قورسی لۆژیك‌و تێڕامانی لۆژیکی بگاتە ئاستێك کۆمەڵگا نەتوانن قبووڵی بکەن‌و بەلاوەی بنێن، ئەوەش مەسەلەیە کە وا لەکۆمەڵگا دەکات بەرەو یۆتۆپیاو میتۆلۆژیا بگەڕێتەوە، هەر کۆمەڵگایەکیش نەتوانێت لۆژیك‌و بەڵگەخوازی لۆژیکی‌و عەقڵی هەرس بکات، ناتوانێت لەقۆناغی یۆتۆپیاو میتۆلۆژیا دەرباز بێت، کۆمەڵگای ئێمەش کۆمەڵگایەکە نەوەکو ناتوانێت ڕووبەڕووی لۆژیك ببێتەوە، بگرە یۆتۆپیاو میتۆلۆژیا ئەوەندە باڵادەستە بەسەریدا بەشێوەیەك قسەکردن لەسەر لۆژیك‌و بەڵگەخوازی لۆژیکی‌و عەقڵی نەوەکو هەرشتێکە ئارەزوو پێکراونییە، بگرە مەسەلەیەکە لەزۆر





لایەنەوە دەچێتە خانەی تابۆو قەدەغەکراو، مەسەلەیەکە ڕەنگە خاوەنەکەی بەرەو لەناوچوون‌و تیرۆرکردن بەرێت.

سوقرات زۆر بەجوانی لەمەسەلەی بەڵگەخوازی دەدوێت‌و دەڵێت:( مایەی غەم‌و پەژارەیە مرۆڤێك بێت لێرەو لەوێ بەڵگەیەك بەدی بکات‌و لەیەکەم چرکەساتدا وا بزانێت ئەوە ڕاستەو حەقە، دواتر بۆی دەربکەوێت هەڵەیە، ئەو کاتەش لەبری ئەوەی لۆمەی خۆی بکات، لەبەرئەوەی پێویستی بەزیرەکایەتی زیاترە، دەبینین لەکۆتاییدا لەبەر بێزاری زۆر دڵشاد دەبێت کاتێك دێت لۆمەکە لەسەرخۆی لادەدات‌و بەگشتی دەیخاتە ئەستۆی بەڵگەکان، دواتریش بەردەوام تا ئەبەد هەرنەفرەت لەبەڵگەخوازی دەکات)(٢٤). بەم جۆرە دیارە جارێك یا دووجار زیاتر بەهەڵەداچوون‌و گیر خواردنی عەقڵ و هزر لەدەست بەڵگەو لۆژیکی بەڵگەخوازی دەبێتە هۆی چ کاردانەوەیەکی تووند لەلای مرۆڤدا، بەشێوەیەك مرۆڤ بەگشتی ڕقی لەکاری هزری‌و عەقڵی‌و بەڵگەیی دەبێتەوەو هەڵوێستێکی دژکارانەی لەئاستدا وەردەگرێت.

## فەلسەفە.........مێژوو

مێژووی فەلسەفە لەدیدو بۆچوونی هیگڵ-ەوە هەمان ئەو مێژووە نییە کە ئێمە بەردەوام فێری بووین‌و لەنێو کتێبەکاندا دەیخوێنینەوە، لەبەرئەوەی هیگڵ فەلسەفەکارێکی دەگمەنە لەنێو مێژووی فەلسەفەدا، ئەوە دیارە چەمکی مێژووش لەلای ئەو بەشێوەیەکی دەگمەن خراوەتە ڕوو. لەلای هیگڵ سەرهەڵدانی فەلسەفە بۆ حەزو ئارەزووەی هزر دەگەڕێتەوە بۆ دۆزینەوەی بەڵگەخوازییانەو لۆژیکی، سەرەتای دەسپێکی فەلسەفەش لەئەزموونەوە دەست پێدەکات، واتا ئەوە ئەزموونە وا دەکات هزر بێداربێتەوە، چونکە لەسایەی ئەزموون‌و فەلسەفەوە هزر دەتوانێت





بەپڕۆسەی باڵابووندا بڕوات بەرەو حاڵەتی سروشتی ڕۆح، واتا باڵابێت بۆ سەر هەستەکانو بەڵگەی هەستخوازی تاوەکو دواتریش بگات بەتوخمی پاكو بێگەردی خۆی، لەسەرەتاوە وادیارە هزر هەوڵدەدات هەڵوێستێکی نێگەتیڤانە لەئاست خاڵی دەسپێکی خۆیدا وەربگرێت، ئەویش ئەزموونی هەستییە، کاتێکیش هزر بەم شێوەیە دژی دیاردە هەستییەکان دەبێت، یەکەم شتیش لەنێو خودی خۆیدا دەیدۆزێتەوە ئەوەیە کە لەنێو بیرۆکەی ماهییەتی هەمەکی ئەم دیاردەیەدایە ئەویش بیرۆکەی(ڕەها-خوا)یە، ئەم بیرۆکەیەش تاڕادەیەکی زۆر بیرۆکەیەکی ئەپستراکت کراوە.

هیگڵ کاتێك دێ قسە لەسەر مێژووی فەلسەفە دەکات، دێت یەکە بەیەکە قۆناغو سەردەمە سەرەکییەکانی نێو مێژووی فەلسەفە بەم شێوەیە کورت دەکاتەوە: خۆرهەڵاتییەکان نەیانتوانی بگەنە ئاستی فەلسەفەو لەسەرمەستی خۆیان دەرنەچوون، بۆیە ڕۆشناییو نوری هزر لەگەڵ یۆنانییەکاندا دەست پێدەکاتو فەلسەفەی یۆنانییەکان بیری لەهزری ڕەها دەکردەوەو پێیان وابووە ئەم هزرە جیهانی بۆ خودی خۆی ئافرێدەکردووە، ئەم فەلسەفەیە، فەلسەفەی یۆنانی-لەخودی هزرەکەوە دەستی پێنەکرد، بەڵکو لەم بابەتگەراییەوە دەستی پێکرد گوایە بابەت پێدراوە، ئەم پێدراوەشی گۆڕی بۆ بیرۆکەی کەینونە، ئالێرەدا هزری ئەپستراکت(نۆس)هات خودی خۆی وەکو جەوهەرێکی هەمەکی نمایش کرد، وەکو هزرێك خۆی دەرخست، بەڵام هزرێکی خودی نا، بەم شێوەیەش هەمەکێتی ئەفلاتونی هاتەبوون، کەچی دەبینین لەگەڵ ئەرستۆ چەمك وەکو هزرێکی ئازادی پاكو بێگەرد ویستی چەمکگەرایی دەردەکەوێت، بەم شێوەیەش هەموو شێوەکانی گەردوون تێپەڕ دەکات، دواتریش چەمك وەکو خودێك وەکو خودی سەیرورەتێك لەسەردەستی ڕواقیو ئەپیکۆرییەکانو گومانکارەکان دەردەکەوێت.

هیگڵ کاتێك لەسەر ئەم ڕاڤەکردنو تێڕوانینەی خۆی بەردەوام دەبێت، دەگاتە ئەو باوەڕەی جیهان وەکو جیهانی هزرەکان، وەکو بیرۆکەیەکی





عەیانی لەلای ئەفلاتونییەتە تازەکاندا سەری هەڵدا، ئەمەش پێڕەوکردن بوو لەئایدیالیستییەتی ئەپستراکت کراو لەنێو واقیعدا، بەڵام دواتر لەزەمەنە تازەکاندا، لەسەردەمە نوێیەکاندا، کار بۆ ئەوە کرا ئەم هزرە وەکو رۆحێك دەسگیر بکرێت، وەکو هزرێك خودی خۆی بناسێت، بۆ ئەوەی ئەم پێشکەوتنەش بێتە دی لەهزری زانراوەوە بۆ ئەو هزرەی خودی خۆی دەزانێتو دەناسێت، ئەوە پێویستە دژکارییەکی بێ کۆتا بوونی هەبێت، پێویستە هزر بگات بەوشیاری دابڕانی ڕەهای خۆی، بەم جۆرەش فەلسەفە هزرییەتی جیهانی تەواوکرد، کاتێك رۆحی جەوهەرو بابەتی بیری کردەوە، ئەم جیهانە رۆحییەی وەکو بابەتی بوون لەدواوەی ئێستا-سروشت-بەرهەم هێنا، ئەوەش یەکەم ئافرێدەکردنی رۆح بوو، ئالەم چرکە ساتەیەشدا کاری رۆح تەنیا ئەوەبوو ئەم دواوە(میتا)یە لەنێو ئێستاداو لەنێو وشیاری خوددا بگێڕێتەوەو دووبارەی بکاتەوە، ئەوەش ئەوکاتە دێتەدی کە وشیاری خود بۆخۆی هزرکاری دەکاتو بوونەوەری باڵاو بێگەرد (جەوهەری ڕەها) دەناسین، کەواتە وشیاری خود هزرکاری لەبارەی خودی خۆیدا دەکات.

لەگەڵ دیکارت هزری پەتی لەنێو ئەم دابڕانەدا دەرکەوتو باڵادەست بوو، سەرەتا وشیاری خود هزرکاری لەخودی خۆیدا دەکات وەکو دەسپێكو سەرەتایەك بۆ کردەی وشیاری، هەروەها لەپێوەندی حەدسیو ئیجابیانەی واقیعی خۆی لەگەڵ(ئەو)یتردا دەکۆڵێتەوە، لەلای سبینۆزا هزرو کەینونە دژو هاوشێوەن، لەلای ئەو حەدس ماهوییە، مەعریفە کردەیەکی دەرەکییە. پرنسیپی گونجاندنو تەبایی لەهزرەوە وەکو هزرێك دێت، لەمۆنادی هزرکاری لایبنتزدا لەخودی هزریش تێپەڕ دەکات.

کاتێك هیگڵ لەم ڕاڤەکارییە قووڵەی بەردەوام دەبێت، ئاماژە بۆئەوە دەکات کە هزر لێرەدا دەگاتە قۆناغێك تێیدا وەکو وشیاریەکی خودی هزرکاری دەکات، لێرەدا بۆ خودی خۆی بوونەوەرێکە، بەڵام لەپێوەندییەکی نەفیکراوو نێگەتیڤیدایە لەگەڵ ئەویتردا، بەم شێوەیەش ئاماژە بۆ فیختە دەکات، گوایە خودێتی لەلای ئەو بەدووشێوە دەردەکەوێت، وەکو





ڕەخنەیەک لەهزر، وەکو پاڵنەرێک بەرەوعەیانی. لێرەشدا هزر دەگاتە شێوەی ناکۆتایی ڕەهای پەتی خۆی، وشیاری خودی، (من)ئەو بروسکەیە کە ماهییەتی ڕۆحی دەبڕێت. بەم جۆرەش ناوەڕۆک ڕەهایەو فۆرم ڕەهایە، هەردووکیشیان هاوشێوەن، ماهییەت لەناوەوەدا یەک شوناسە لەگەڵ مەعریفە، دواتر وشیاری خود ئەو کاتە پێوەندی پۆزەتیڤی خۆی وەکو پێوەندییەکی نێگەتیڤی دەناسێت، پێوەندی نێگەتیڤی خۆیشی وەکو پێوەندییەکی پۆزەتیڤی، بەمانایەکی تر ئەو ئەم دووکردەیە دژە وەکو یەک بەدی دەکات، واتا هزری خالص(پەتی) یا کەینونە وەکو هاوشێوە بوونێک لەگەڵ خود یا شوناسی(ئەو)بەدی دەکات، شوناسی (ئەو)یش وەکو دابڕانە. ئەوە لەلای هیگڵ حەدسی زهنی یا هزرییە، بەڵام بۆ ئەوەی بەڕاستی هزری بێت مەرجە ڕاستەوخۆ ئەوحەدسی ئەزەلییوئیلاهیی نەبێت، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕەها عارف بێت، ئەم حەدسەی خودی خۆی ناناسێت، ئەوە ئەو سەرەتاو ئەو دەسپێکەی کە لێیەوە دەست پێدەکرێت وەکو یەکەم گریمانی ڕەها، ئەو تەنیا ئاوها حەدسییە، مەعریفەیەکی ڕاستەوخۆیە، وشیاری خودی نییە. بەدەربڕینێکی تر، هیچ شتێک نازانێت، ئەوەی حەدس دەکات دیارنییە، لەباشترین حاڵەتدا هزرێکی جوانە، نەوەکو مەعریفە بێت(٢٥).

کەچی لەلایەکی ترەوە دەبینین ئەو زانستانەی لەسەر بنچینەی ئەزموون دامەزراون، ئەوە ڕۆح هەوڵدەدات پاڵیان پێوەبنێت بۆ ئەوەی لەو وێنەو شێوەیە ڕەت بدەن کە ناوەڕۆکە جیا جیاکانی لەسەری دەردەکەون، هەروەها هەوڵدەدات ئەم ناوەڕۆکانە باڵاتر بکات، بۆئەوەی بگەنە ئاستی حەقیقەتی پێویست، چونکە وقائیعی زانست وادیارە وەکو ئەوەی قەبارەیەکی ئاوێتەکراوی مەزن بێت بەشێوەیەک شتەکان لەڕێز یەکترییەوە ڕیزکراون، لێرەدا ئەم شتانە وادەردەکەون گوایە تەنیا پێدراوو ئامادەن، بەکورتی وادیارە هیچ پێوەندییەکی جەوهەری یا پێویست بوونی نەبێت، وەکوئەنجامێکی ئەم پاڵنەرەش دەبینین هزر لەهەمەکێتی خۆی





دەردەچێت، ئەو هەمەکێتییەی کە نەهاتۆتەدی، لەو تێربوونەی دەردەچێت کەتا ئەوکاتەش مومکینە بێتەدیوناچارە خودی خۆی پێشڤە ببات، ئەم پێشڤەچوونەش مانای ئەوەیە هزر ناوەڕۆکە زانستییەکان بەهەموو وردەکارییەکانەوە بەرجەستە دەکات، هەروەها وا لەم ناوەڕۆکانەش دەکات هاوشانی کردەی ئەسڵیو داهێنەرانەی هزر بنو دەربڕی لایەنی گەشەکردنی هزر بن.

لەلای هیگڵ فەلسەفە ئەوە دەسەلێنێت کە پێوەندی خوا لەگەڵ جیهاندا لەخودی سروشتی خواوە سەرچاوە دەگرێت، ئەم پێوەندییەش هەر لەلایەنی خواوە دیاریکراوە(٢٦). هیگڵ لەو باوەڕەدایە هزری فەلسەفی، تەنیا هزری فەلسەفی ڕێگای ئەوەمان پێدەدات لەناوەڕۆکی ڕاستەڤینەی نێو مێژووی گەردوون تێبگەین، ئەوەش لەسایەی دۆزینەوەی ئەو توخمە عەقڵانیانەی ناوەوەی، لەهەمان کاتیشدا ڕێگای ئەوەمان پێدەدات لەئێستاو ڕاستەوخۆی واقع تێبگەین، ئالێرەدا لەلای هیگڵ فەلسەفە دەبێتە تاکە گرێنتی لەدەست بەهەڵەداچوونو فریودانی ئیدراکدا، چونکە حەقیقی دەبێت عەقڵانی بێت، بیرۆکەش لەبنچینەدا شتێکی مەلموسە، لەبەرئەوەی حەقیقییە، کەچی ئەپستراکت ئەو شتەیە کە حەقیقی نییە،.ڕاسنە فەلسەفە لەنێو چوارچێوەو سنووری هزری ئەپستراکت کراودا کاردەکات، بەڵام وادەخوازێت وەکو شتێکی مەلموسو عەینی تێی بڕواندرێت، ئەوەش ڕاستە کە بیرۆکە یا هزر وەکو هزرێکی ڕووت، بێگومان بریتییە لە جۆرێک لەئەپستراکت، بەڵام ئەو وەکو خودی خۆی ئەپستراکت نییە، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕەها مەلموسە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زۆر دژو ناتەبایە لەگەڵ ئەپستراکت، بەتووندیش دژایەتی ئەو نمایندەو وێنانە دەکات کە هزر بەرهەمیان دێنێت، بۆیە تەنیا فەلسەفە دەتوانێت دەربڕی بابەتی مێژوو بێت، چونکە مێژوو بابەتێکی مەلموسە. واتا ئەو بابەتەیە کە سەرجەم ڕووە جیاوازەکانی بوون لەخۆیەوە دەگرێت، ئەو جەوهەرەیە کەرۆحی جیهان دەردەبڕێت. خودی ئەم بابەتە مەلموسەو لەشێوەی هەستناکییەوەو

لەپێشڤەچوونی پێداویستی خۆیدا، ئەو بابەتەیە فەلسەفە بۆخۆی دەیکات بەبابەت کاتێك چارەسەری مێژوو دەکات. ئا لێرەدا لەلای هیگڵ حەقیقەتی مێژوویی ملکەچی بەڵگەخوازی فەلسەفی دەبێت(٢٧).

هیگڵ لەدرێژەی ڕاڤەکارییەکانی خۆیدا بۆ مێژووی فەلسەفە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات مەعریفەی خوا وەکو هەموو شتێکی واقیعی لەهەست تێپەڕ دەکات، ئەم مەعریفەیە مۆرکێکی حەقخوازانەی پێوەیە، لەبەرئەوەی بالأبوونە بۆ سەر هەستو ئیدراکی هەستی، کەواتە ئەم مەعریفەیە لەناوەڕۆکدا هەڵویستێکی نێگەتیڤانە لەپێدراوی هەستی یەکەمیدا لەخۆیەوە دەگرێت، تا ئەم ئاستەش نێوەندبوونێك لەخۆیەوە دەگرێت، چونکە ئەم نێوەندبوونە مانای ئەوەیە کە تۆ شتێك بکەیتە خاڵی سەرەتاو لەوێوە بەرەو شتێکی ترو خاڵێکیترەوە بڕۆیتو هەنگاو بنێیت، بەشێوەیەك بوونی شتی دووەمو خاڵی دووەم پەیوەست بێت بەگەیشتنی ئێمە لەسایەی شتێکی ترەوە کە لەئەو جیاوازە، واتا شتی یەکەمو خاڵی یەکەم، سەرەڕای ئەوەش مەعریفەی ئێمە بەخوا ئەنجامێك نییە پشت بەلایەنی ئەزموونکاری وشیاری ئێمە ببەستێت، چونکە لەواقیعدا سەربەخۆیی ئەو بەشێوەیەکی جەوهەری دێتەدی، ئەویش لەڕێگای ڕفاندنی پێدراوە واقیعییەکانی هەست یابالأبوون بەسەریاندا، لێرەدا هیگڵ دیسان دەگەڕێتەوە سەر واقیعەی نێوەندبوونو هەندێك شت ڕوون دەکاتەوەو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەگەر ئێمە بێین وابڕوانینە واقیعەی نێوەندبوون گوایە لەپێشەوەی کردەکەدایەو وانمایشمان کرد گوایە مەرجێکە، ئەوە دیارە دەشێت بگوترێت خودی فەلسەفە ئەنجامی ئەزموونەو بۆ سەرهەڵدانی خۆی قەرزداری واقیعەیەکی پاشینەییە، ئەم گوتەیەش لای هیگڵ بێ بایەخو بێ بەهایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێی وایە لایەنێکی پێشینەیی لەنێو هزردا بوونی هەیە، چونکە ئێمە ئەوکاتە دەگەینە مەعریفەی ڕاستەوخۆ کە خودی مەعریفەی ڕاستەوخۆ وەکو هەمەکییەك بێت، ئەوکاتە دەگەینە ئەو مەعریفەیە، کاتێك هزری







ئاوەژووکار خودی خۆی دەکاتە نێوەندو هیچ شتێکی ترنییە ببێتە نێوەند لەنێویدا، ئەم هەمەکێتییەش بریتییە لەڕازی بوونی خودی هزر، ڕازیبونێك بەڕادەیەك هەست بەبوونی خۆی بکات وەکو ئەوەی لەنێو ماڵی خۆیدا بێت، ئەو کاتەش بایەخ بەوە نادات بێتە خوارەوە بەرەو شتە جوزئییەکانو سروشتی تایبەتی خۆی پێشڤە ببات، ئەوەش هەمان حاڵەتی ئایینە، جا ئایین بەوێنەی سادەی خۆی بێت، یا وێنەی پێشڤەچوونی، وێنەی وردەکاری زانستی  وەربگرێت، یاخۆی لەنێو وێنەی ئیمانێك لەنێو دڵێکی سادەدا چەقبەست بکات، لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا ئاماژە بۆ مۆرکی خودی خۆی دەکات، مۆرکی ڕازیبونو بەختەوەری، بەڵام ئەگەر هزر لەقۆناغی هەمەکێتی هزرەکان تێپەڕ نەکات ( وەکو ئەوەی لەنێو فەلسەفەی گریکیدا بوونیان هەبووە، بۆنموونە ئیلییەکان نەیانتوانی لەبیرۆکەی بوون تێپەڕ بکەن، هیراکلیتس نەیتوانی لەبیرۆکەی سەیرورەت تێپەر بکات)(٢٨)، ئەوە دیارە دەرگا بۆ ئەوە والأدەکات بەفۆڕمی لیستییەت ناودێر بکرێت، تەنانەت هیگڵ پێی وایە ئێمە دەتوانین لەقۆناغێکی پێشکەوتوو تری فەلسەفەشدا ئەو مەزهەبوو ڕێبازانە بدۆزینەوە کە گوتەیەك یا بۆچوونێك بەسەریاندا بالأیەو کۆنتڕۆڵیان دەکات، وەکو ئەو گوتەیەی دەلێت:( لەنێو ڕەهادا هەمووی یەك شتە)، یائەو گوتەیەی دەڵێت:( خودو بابەت لەنێو یەك شوناسدا یەکدەگرن)(٢٩). خودی ئەم ڕێبازانە هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، کاتێك قسە لەسەر جوزئییات دەکەین، ئێمە ئەگەر بێین ئەم قۆناغە بەراییانەی هزر ڕەچاو بکەینو لەبەرچاویان بگرین، ئەو قۆناغانەی قۆناغ بەگشتی کردنێکی تەواون، ئەوە دیارە دەڵێین ئەزموون تاکە سەرچاوەی ڕاستەقینەی گەشەکردنو پێشڤەچوونی فەلسەفەیە، لەبەرئەوەی ئێمە دەبینین زانستە ئەزموونگەرییەکان بەتەنیا لەسەر ئاستی تێبینی کردنی سیمای تاکگەرایی هیچ دیاردەیەك ناوەستن، بەڵکو ئەم زانستە ئەزموونگەراییانە بەهاوکاریو پاڵپشتی هزر دەتوانن ئەو ئامادەگیانە بەفەلسەفە ببەخشن کەخودی

فەلسەفە لەشێوەی وێنەو شێوەیێکی گشتیدا ئامادەیان دەکات، لێرەشدا هیگڵ مەبەستی یاساکانە، واتا فەلسەفە ئەو یاسایانە بەزانستە ئەزموونگەراییەکان دەبەخشێت، لەلایەکی ترەوە هزر دێت سەرجەم وقائیعە جوزئییەکان بەفەلسەفە دەبەخشێت، لێرەدا هزر ناچارە بەرەو ئەم ڕاستییە عەینییە تایبەتییانە بچێت، پێشوازی کردنی فەلسەفە لەم ماددە زانستییانە وای لێدەکات واز لەوە بێنێت تەنیا پێدراوێکی ڕووت بێت، ئالێرەدا هزر ڕاستەوخۆیی خۆی بەلاوە دەنێت و ڕەشدەکاتەوە، بەم شێوەیەش هزر لەدەرەوەی خودی خۆیدا پێشڤەچوون بەدەست دێنێت، ئا ئەوە ئەم خاڵەیە لەلای هیگڵ کەوا دەکات فەلسەفە قەرزاری پێشڤەچوونی زانستە ئەزموونگەراییەکان بێت، لەبەرانبەر ئەوەشدا فەلسەفە شتی زیندەگی پێشکەش بەناوەڕۆکی ئەم زانستە دەکات، مەبەستی هیگڵ‌یش لێرەدا ئازادی هزرە، هیگڵ پێی وایە بۆ ئەوەی فەلسەفە سەرهەڵبدات پێویستە ئازادی بوونی هەبێت، ئەو گەلەی فەلسەفە تێیدا دەست پێدەکات ئەوە دەبێت بەکردارەکیانە ئازادی وەکو پرنسیپێك تێدا بێت، بۆ ئەوەی ئەم گوتەیەی خۆیشی بسەلمێنێت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەنێو مێژوودا دیارە تەنیا ئەوکاتە فەلسەفە سەرهەڵدەدات، کاتێك دەستووری ئازادیخواز دادەڕێژرێت(٣٠).

ئەوانەی خستمانە ڕوو سەرهەڵدانو پێشڤە چوونی فەلسەفە بوو، لەڕوانگەی بۆچوونی هیگڵ‌ەوە، دیارە مێژووی فەلسەفەش لەڕوانگەی مێژووییو دەرەکیدا، هەمان ئەم ڕەوتەمان پێشکەش دەکات، لەبەرئەوەی ئەو قۆناغانەی کە تێیدا هزر پێشڤە دەچێت لەنێو مێژوودا وا دیارە کە بەڕێکەوت کەوتوونەتە دوای یەكو خودی ئەم قۆناغانەش بریتین لەکۆمەڵێك پرنسیپیجیاوازو پەرت وبلاو، ئەو پرنسیپانەش وادیارە کۆمەڵێك ڕێبازی فەلسەفی جیاواز لەگەڵ خۆیانیاندا دایان هێناوە، بەلاّم لای هیگڵ ئەم بۆچوونە ڕاست نییە، هیگڵ بڕوای بەم بۆچوونە نییە کە ئەوە ڕێکەوتە وایکردووە ئەم قۆناغانە بە دوای یەکدابێنو مێژوویێك





پێکبهێنن کە ئێمە ناوی دەنێین مێژووی هزر، بەڵکو هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ تەنیا یەك ئەندازیار بوونی هەبووە ڕێڕەوی کەشتی مێژووی ئاراستە کردووە، ئەم ئەندازیارەش لەلای ئەو بریتییە لەعەقڵی یەکتاو زیندوو، عەقڵێك سرووشتی خۆی وایە بیردەکاتەوە و ئەو شتەی بوونی هەیە بەرز دەکاتەوە بەرەو پلەو پایەی وشیاری خودی، بەشێوەیەك خودی ئەم وشیارییە دەبێتە بابەتێكو دەچێتە ئاستێك لەسەرووی خۆیەتی بۆ ئەوەی بگاتە قۆناغێکی بالآتر لەقۆناغەکانی بوونی خۆیدا، ڕۆح لەدوا قۆناغدا ئیدراك بەوە دەکات کە فەلسەفە بریتییە لەسەرجەم حەقیقەتی واقیعی، چونکە ڕۆحی فەلسەفی، جیهان وا بەدی دەکات گوایە تەنیا بەرجەستەکردنو تەجەللی هزرە، واتا تەجەللی بوونی خودی خۆی، چونکە جیهان بریتییە لەخودی خۆی، لەبەرئەوەی بابەتەکەی لەگەڵ خودی خۆیدا لەنێو یەك ناسنامەدا بەرجەستە بووە، بۆیە فەلسەفە یەکەی کۆتایی خودییەتیو بابەتییە، ئەو ڕێبازە فەلسەفییە جیاوازانەی مێژووی فەلسەفە بۆ ئێمە نمایشیان دەکات، ئەستەم نییە لەنێو یەك ناسنامەدا ڕێك بکەون، دەشێت بڵێین ئەوە یەك فەلسەفەیە، بەلاّم لەقۆناغی جیاجیای پێگەیشتندان، یا دەشێت بلێین ئەم پرنسیپە جوزئیاتەی هەر ڕێبازێکی فەلسەفی بۆ خۆی بەتەنیا لەسەر بونیادنراوەو ڕاوەستاوە، تەنیاو تەنیا لقێکە لەهەمموویەکی گشتگیردا، ئەویش هزرە، لەلای هیگڵ مەزهەبو ڕێبازە دواییەکانی فەلسەفە ئەنجامی سەرجەم مەزهەبو ڕێبازەکانی پێشووترن، هەر ڕێبازێك کە لەقۆناغێکی دواتردا دێت، دەبێت سەرجەم پرنسیپە فەلسەفییەکانی تری مەزهەبەکانی پێش خۆی لەخۆیەوە بگرێت، کاتێکیش دواترین مەزهەبی فەلسەفی ناوی مەزهەبی فەلسەفی لێدەنرێت، ئەوە پێویستە لەسەری لەهەموو مەزهەبو ڕێبازەکانی تری پێش خۆی تەواوترو باشتر بێتو لەهەمووشیان تۆتالیتاریو گشتگیرتر بێت.

دیمەنی ئەم هەموو مەزهەبە فەلسەفییە جیاوازە لەنێو ڕێڕەوی مێژوودا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چەند پێویستە دەستنیشانی پێوەندی نێوان هەمەکیو جوزئیی بکرێت، بەپێی بۆچوونی هیگڵ بۆ ڕاڤەکردنی فەلسەفەو مێژووی فەلسەفە، ئەوە دیارە مەزاهیبە فەلسەفییەکان یەکترنابڕن، مەزاهیبی فەلسەفی دووهێلی یەکتربڕنین، یەکێکیان بێت تاوەکو هەموو ئەو مەزاهیبانەی بەر لەخۆی بسڕێتەوەو بەلاوەیان بنێتو لەناویان بەرێت، کەواتە ئەم مەزاهیبانە دژکار نین، بەڵکو یەکتری تەواو دەکەن، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ڕینماییەکانی بارمندیس(٣١)ڕاستن، ڕێنماییەکانی هیراکلیتس(٣٢)ڕاستن، ڕێنماییەکانی هیراکلیتس دژی ڕێنماییەکانی بارمندیس نییە، بەڵکو ئەم ڕێنماییانە لەناوە خۆی دەگرێتو لێشی تێپەڕ دەکات، چونکە بیرۆکەی بنەڕەتی کەبریتییە لەگوتەی سەیرورەت لەخودی گوتەی وجود تێپەڕ دەکات، ئا لێرەوەیە ئەستەمە ئێمە مەزاهیبو بۆچوونی فەلسەفی بەهەڵەدا بنێن، هەموو مەزاهیبە فەلسەفییەکان ڕاستو دروستن، بەڵام هەندێکیان لەهەندێکی تر فراوانترن، خودی فەلسەفەی هیگڵ‌ی کورت کراوەی ئەم زنجیرە مێژووییە. ئەوەش تێڕوانینی هیگڵ‌ە بۆ مێژووی فەلسەفە، چونکە ئەو پێی وایە مێژووی هەمەکێتی جیهان بەتەنیا ئاوا بەرێکەوت بەرێوە ناڕوات، بەڵکو ئەوە هزرە یا عەقڵە حوکم لەڕێڕەوو ڕووگەو ئاراستەکەی دەکات(٣٣).

دوای ئەم هەموولێکدانەوەو خوێندنەوەیە بۆ مێژووی فەلسەفە، هیگڵ دەگاتە ئەو باوەڕەی خودی ئەم پێشڤەچوونەی مێژووی فەلسەفە بۆمانی دەخاتەڕوو، لەنێو خودی سیستەمی فەلسەفیشدا بوونی هەیە، لێرەدا مەبەستی هیگڵ لەسیستەمی فەلسەفی تێڕوانینی تایبەتی فەلسەفییانەی خۆیەتی، واتا ئەو فەلسەفەیەی بۆ خۆی کاری لەسەر دەکات، ئێمە لەبری ئەوەی بێین لەدەرەوەدا بەدوای ئەم پێشڤەچوونەدا بگەڕێین، وەکو ئەوەی مێژووی فەلسەفە لەکاتی لێکۆڵینەوەی خۆیدا ئەنجامی دەدات، ئەوە دەبینین بزاڤی هزر زۆر بەڕوونی لەگەڵ نێوەندی هزری تایبەت بەخۆیدا





یەکدەگرێت، کاتێکیش هزر هزرێکی ڕەسەنو ئەسڵی دەبێت، ئەوا لەلایەنی ناوەکییەوە دەبێت عەینی بێت، دەبێت بیرۆکە بێت، کاتێکیش وای تێدەڕواندرێت وەکو هەمەکییەکی تۆتالیتاری، ئەوە دەبێتە بیرۆکە یا ڕەها، ئەو کاتەش پێویستە ئەم هزرە سیستەمێك پێکبهێنێت، چونکە خودی حەقیقەت بۆ خۆی عەینییە، بەمانای ئەوەی لەکاتێکدا ئەو پرنسیپە هەمەکیەشمان پێشکەش دەکات، ئەوە لەهەمان کاتدا لەناوەوەی خۆیدا سەرچاوەی پێشڤەچوون لەخۆیەوە دەگرێت، لێرەوە هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەو دەتوانێت بڵێت حەقیقەت بریتییە لەسەرجەمی هزرو ئازادی هەمەکی، ئەو کاتەش پێداویستی بوونی بەشە لاوەکییەکانی کە ئەم هەمەکییە پێکدەهێنن مومکین نابێت، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە ئەم بەشانە جیا دەبنەوەو بەجیاوازی دەردەکەون. ئەوەش هیگڵ‌ی بەم ئاڕاستەیەدا برد بگاتە ئەو باوەڕەی ئەگەر فەلسەفە سیستەمێك پێك نەهێنێت، ئەوا نابێتە ئەنجامێکی زانستی، چونکە فەلسەفەکاری ناسیستەمی ناشێت چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت بتوانێت ببێتە دەربڕی تایبەتمەندی کەسایەتی تایبەت بەعەقڵ، بەبێ ئەوەی ئەو پرنسیپە لەخۆیەوە بگرێت کە ناوەڕۆکی خۆی پێوە ڕێکبخات. ڕاستییەکانی فەلسەفە لەلای هیگڵ بێ بەهایە، ئەگەر ئێمە چاوپۆشی لەو پاڵپشتی کردنە هاوبەشەو یەکێتییە ئۆرگانییەی نێو سیستەم بکەین، ئەو کاتەش دەبێت وا چارەسەر بکرێت گوایە گریمانی بێ بنچینە تەنیا کۆمەڵێك بیرو باوەڕو بۆچوونی کەسایەتین.

بەڕاستیش زۆر لێکۆڵینەوەی فەلسەفی بوونیان هەیە کە خۆیان لەنێو ئەم گۆشەیەدا گیر دەکەن، ئەو فەلسەفە ڕەهایەی هیگڵ باسی لێوە دەکات، دواقۆناغی ڕۆحی ڕەهایە، ئەگەر ئێمەش وابڕوانینە فەلسەفە ئەوا دەبینین مەعریفەیەکی ڕەهایە، مەعریفەیەك لەبەرئەوە نا کە بابەتێکی هەمەکییە، وەکو هونەر یا ئایین، بەڵکو لەبەرئەوەی مەعریفەی فەلسەفی لەبنەڕەتدا بریتییە لەمەعریفەی هزر، یا وردتر بڵێین بریتییە لەخودی

بیرۆکە، فەلسەفە بریتییە لە مەعریفەبوون بەخودی بیرۆکە-هزر، چونکە ئەوەی بەبیرۆکە یا بەعەقڵی فەلسەفی دەناسرێت، ئێستا لەم چرکەساتانەدا لەو شتانە جیابۆتەوەو دابڕاوە کەهەستناکن‌و هەستین، بۆیە هزرێکی پەتییە، ئا لێرەوە هزر بۆ خۆی دەبێتە خودو بابەت لەیەك کاتدا، یەکەم قۆناغی پێشقەچوونی رۆحیش لەپاڵنەرەوە سەرچاوە دەگرێت، پاڵنەری ئەوەی کەئەم کەلێنە ببڕێت کە دەکەوێتە نێوان خودو بابەت، ئێستاش ئەم پەڕینەوەی ئەنجام دا، بەم شێوەیەش پێشقەچوونی رۆح بەرەو کامل بوون دەچێت(٣٤)، لێرەدا ئێمە ناچینە نێو مەسەلەی پێشقەچوونی رۆح، چونکە ئەوە بابەتێکی جیاوازەو لەدەرفەتێکی تردا باسی لێوە دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەم پرۆسەیەی پێشقەچوونی عەقڵی فەلسەفیدا، ئێمە دەگەینە ئەو ئەنجامەی عەقڵی فەلسەفی مادامەکی لای هیگڵ خودی ئەو عەقڵەیە کە ئاگاداری هەموو شتێکەو شارەزای هەموو مەعریفەیەکە، ئەوە دیارە ئەم عەقڵە فەلسەفییە هەمان عەقڵی خواییە، لەلای هیگڵ هەر بەشێك لەبەشەکانی فەلسەفە هەمەکێتییەکی فەلسەفی پێکدەهێنن، لەبەرئەوەی هەر بەشێك بۆ خۆی بازنەیەکی داخراوە بەسەر خۆیدا، خودی خۆی تەواو دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەر بەشێك لەم بەشانەدا دەبینین بیرۆکەی فەلسەفی لەشێوەی وێنەیەکی جوزئیی تایبەت یا لەنێو نێوەندێکی تایبەتدا دەردەکەوێت.

مادامەکی هەر بازنەیەکیش بۆخۆی بریتییە لەهەمەکێتی حەقیقی، ئەوە دیارە ئەو سنوورانە تێکدەشکێنێت کە نێوەندی تایبەتی بەسەریدا دەیسەپێنێت، بۆ ئەوەی بازنەیەکی فراوانتر دابهێنێت، بەم شێوەیە سەرجەم فەلسەفە وادەردەکەوێت وەکو ئەوەی بازنەیەکی گەورە بێت لەکۆمەڵێك بازنەی بچوکتر پێکهاتبێت، لەنێو هەر بازنەیەکی جوزئیشدا لەنێو هەر بازنەیەك لەم بازنە بچوکانەدا بیرۆکە دەردەکەوێت، بەڵام بیرۆکە وەکو شتێکی هەمەکی‌و گشتی ئەوە لەهەمان کاتدا لەنێو سیستەمی گشتیدا دەردەکەوێت واتا لەنێو بازنەی گەورەدا. ئەوەش لەلای هیگڵ واتا








فەلسەفە بەگشتی یەك زانست پێکدەهێنێت لەهەمان کاتیشدا دەشێت واتێی بڕواندرێت گوایە بریتییە لەکۆمەڵێك زانستی جوزئی(٣٥)، بەم شێوەیە دەبینین مەزهەبی هیگڵ بەبازنەی رۆحی رەها کۆتایی دێت وەکو ئەوەی ئەم خول خواردنەوەیەی هزر لەدەوری خۆی ئەنجامی کۆتایی‌و دوایی هەمووپێشقەچوونێك بێت، بەڵام دیارە بەپێی پرنسیپە هیگڵ‌ییەکان خودی ئەم خولگەییە بنچینەی ڕەها یا سەرەتای ڕەهایەو سەرلەنوێ دەست پێکردنەوەیە، واتا کۆتایی فەلسەفە لەو کاتەی کۆتاییە لەهەمان کاتیشدا سەرەتاو دەسپێکە، هەر ئەوەش مەبەستی هیگڵ-ە، چونکە ئێمە لەکۆتایی مەزهەبەکەیدا دەگەینەوە بەخودی فەلسەفە، ئەگەر پرسیاری ئەوەش بکەین ئەو فەلسەفەیە چییە ئێمە پێی گەیشتین، ئەوە وەڵامەمان ئەوەیە کە پێویستە سەر لەنوێ دەست بەخوێندنەوەی لۆژیکی هیگڵ‌ی بکەین، لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە بچینە نێو لۆژیکی هیگڵ‌ی ئەو کارە بۆ دەرفەتێکی تر جێدەهێڵین.

نمایشکردنی فەلسەفە بەم شێوەیە مێژووییە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هیگڵ ڕەچاوی پێداویستییەکانی سەردەم دەکات، دڵنیایە لەوەی فەلسەفەکار بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت لە (رۆحی جیهان) تێپەڕ بکات، وەکو ئەوەی لەهەر سەردەمێك لەسەردەمەکانی مێژوودا دەردەکەوێت، د..زەکەریا ئیبراهیم بەرەو ئەوە دەچێت نەزعەی سەرەکی هزری هیگڵ‌ی لێرەدا بەرەو ئەوە دەچێت هەوڵێك بێت بۆ لەناو بردنی دڵەڕاوکێی مرۆڤ لەئاست جیهانی شتەکانداو هەستکردنی مرۆڤ بەنامۆیی لەنێو جیهان و ژیاندا لەنێو بابەتی دەرەکی کە تێیدا خودی خۆی ناناسێتەوە(٣٦).

هیگڵ کاتێك دوای ئەم نمایشە بۆ مێژووی فەلسەفەو بەشەکانی فەلسەفە کە لەکۆتاییدا زانستێك پێکدەهێنن بەناوی زانستی فەلسەفە، لەوە ئاگادارمان دەکاتەوە کە پێویستە ئێمە لەکاتی لێکۆڵینەوەماندا نابێت ئینسکلۆپیدیای فەلسەفە تێکەڵاوی ئینسکلۆپیدیا مەئلوفەکانی تر بکەین، لەبەرئەوەی ئینسکلۆپیدیا مەئلوفەکان تەنیاو تەنیا کۆکردنەوەی

زانستەکانە، هیچ پرنسیپێك نییە ڕێکیان بخات، بەڵکو تەنیا وانمایشیان دەکات وەکو ئەوەی ئەزموونەکان پێشکەشیان دەکەن، بگرە پێ لەسەر ئەوەش دادەگرێت کە ئەم ئینسکلۆپیدیایانە هەندێکجار تەنیا ئەو شتانە نمایش دەکەن کە ناوی زانستیان لێنراوە، کەچی لەواقیعدا تەنیاو تەنیا کۆکردنەوەیەکی بێ بەرنامەیە بۆ چەند زانیارییەکی پەرتو بلاو، لەنێو شتێکی ئاواشدا دەبینین لقە جیاجیاکانی مەعریفە بەپێی هەندێك هۆکاری دەرەکی شوێنی خۆیان لەنێو ئینسکلۆپیدیا داگیر دەکەن، کەواتە یەکێتییەکەیان وا دیارە کە یەکێتییەکی دروستکراوە، بۆیە هیگڵ پێی وایە ئێمە دەتوانین بڵێین ڕێکخراوە یا چاککراوە، بەڵام ناتوانین بڵێین سیستەمێك پێکدەهێنن، لەبەر ئەو هۆیەشە واتا ماددەکان لەسەر بنەمای یەك پرنسیپ یا بنەما کۆناکرێتەوە، دەبینین بۆیە ڕێکخستنی ماددەکان لە باشترین شێوەدا تەنیا ڕێکخستنو تەرتیب کردنێکی ئەزموونگەرایییە، بۆیە بەردەوام شتی ناتەواو نمایش دەکات، بەڵام لەو لاشەوە هیگڵ دێت باس لەوە دەکات کە ئینسکلۆپیدیای فەلسەفی سێ جۆرە زانستی جوزئیی بەلاوە دەنێت، بەم شێوەیەی خوارەوە(٣٧):

١) لەسەرەتادا کۆمەڵێك زانیاری پەرتو بلاو بەلاوە دەنێت، فیلۆلۆژیاش ڕاستەوخۆ بەشێکە لەم کۆمەڵەو گروپە.

٢) ئەو نیمچە زانستانەش بەلاوە دەنێت کە لەسەر ویستی زۆردارانە دامەزراون وەکو زانستی(رنوك-هیرالدیتا)(٣٨)،ئەم جۆرە زانستانەش هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی زانستی داهێنراون.

٣) بەشێکی تری زانست بوونیان هەیە، ئەوانیش داهێنراون ئەگەرچی بنچینەیەکی عەقڵیو سەرەتایەکی عەقڵییان هەیە، ئەوانەش توخمی وان کە فەلسەفە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە توخمی ئەون، بەڵام سیمای داهێنراوی ئەم زانستانە بەخاسیەتی بنەڕەتی دەمێنێتەوە.

هیگڵ وەکو ئەوەی دیارە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە فەلسەفەکەی ئەو جەوهەرو ناوەڕۆکی هەموو فەلسەفەکانی تری بەر لەخۆی لەناوە خۆی





دەگرێت، بەڵام وەکو ئەوەی تێبینی دەکرێت دیارە هیگڵ بەشێوەیەکی زۆر تووند کەوتۆتە ژێر کاریگەری دوو ڕەوتی فەلسەفی، یەکەمیان ئایدیالیزمی گریکییە، دووەمیش فەلسەفەی ڕەخنەیی کانت-ە، لەبەرئەوەی پرنسیپە سەرەکییەکانی فەلسەفەو تێڕامانی فەلسەفی هیگڵ هەمان ئەو پرنسیپانەی فەلسەفەی ئایدیالیزمی گریکیو فەلسەفەی ڕەخنەیی کانت-ن، ئەوەش وا لەهزرڤانێکی وەکو والاس دەکات بڵێت:( ئەوەی هیگڵ گەرەکییەتی بیڵێت نە نوێیەو نە مەزهەبێکی تایبەتە، بەڵکو فەلسەفەیەکی هەمەکی گشتییەو نەوەکان یەك لەدوای یەك باسیان لێکردووە، جارێك بەشێوەیەکی بەرفراوانو جارێکیش بەشێوەیەکی بەرتەسك، بەڵام جەوهەرەکەی هەر وەکو خۆی ماوەتەوەو نەگۆڕاوەو بەردەوامیش لەوە وشیاربووە کە ماوەتەوەو بەردەوام هەست بەشانازی دەکات، چونکە لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتون وئەرستۆ......تاد، یەکیگرتووە)(٣٩).

وا دیارە لەلای هیگڵ بۆ ئەوەی فەلسەفە لەنێو ڕەوتی خۆیدا دەست بەکارکردن بکات، وەکو سەرجەم زانستەکانی تر پێویستە لەگریمانەیەکی پێشینەیی دەست پێبکات، زانستەکانی تر سەرەتا بەهەندێك گریمانی بەدیهی دەست پێدەکەن، وەکو(شوێن و ژمارە و......تاد،)بۆیە ڕەنگە بشێت بگوترێت کەوا پێویستە لەسەر فەلسەفەش وەکو گریمانێك لەم خاڵەوە دەست پێبکات کە دان بەبوونی هزر بنێت، کەچی دەبینین هیگڵ پێی وایە ئەم دوو حاڵەتە هاوشێوە نین، واتا حاڵەتی فەلسەفەو حاڵەتی زانستەکانی تر وەکو یەك نییە، لەبەرئەوەی فەلسەفە خۆی بەبۆچوونو تێڕامانێك سەرقاڵ دەکات، بەکردەیەکی ئازاد لەکردەکانی هزر، ئەوەش کردەیەکە دەچێتە نێو خودی خۆی، بەم جۆرەش لەخودی خۆیەوە بابەتی خۆی وەردەگرێتو هەڵدەهێنجێت، بەم جۆرەش لەلای ئەو ئەم بۆچوونو تێڕوانینەی فەلسەفە لێیەوە دەستی پێکردووە لەکاتی کاروانی پێشڤەچوونی زانستی فەلسەفیدا، دەگۆڕێت بۆ ئەنجام، ئەوەش ئەنجامێکی کۆتاییە، چونکە لەو ئەنجامەوە فەلسەفە دەگەڕێتەوە سەر خودی خۆیو

دەگاتەوە ئەو خاڵەی سەرەتا لێیەوە دەستی پێکردووە، بەم شێوەیەش فەلسەفە وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی بازنەیەکی داخراو بێت بەدەوری خودی خۆیداو بەمانای مەئلوفی نێو زانستەکان سەرەتایەکی دیاریکراوی نییە، دەشێت بەشێوەیەکی تر ئەم مەسەلەیە بخەینە ڕوو، هزری تۆتالیتاریو گشتگیری زانستی، واتا ئەو هزرەی لێیەوە دەست پێ دەکەین، چونکە هزرێکی سەرەکییە، بریتییە لەدابڕانی نێوان ئەو هزرەو بابەتەکەماندا، ئەو خودەی کە فەلسەفەکاری دەکات لەدەرەوەی ئەم بابەتەدا، ئەوەش هزرێکە پێویستە خودی زانست ئیدراکی پێبکاتو تێی بگات، ئێمەش ئەوە دەزانین کە فەلسەفە چالاکیو ئامانجو مەبەستێکی هەیە، ئەویش ئەوەیە ئێمە بگەین بەهزری گشتگیر لەبارەی هزرە گشتگیرەکەی، بەوەش ئێمە گرەنتی گەڕانەوەی وەردەگرین.

هیگڵ دوای ئەم هەموو ڕاڤەکارییەی خۆی، دێت فەلسەفە بەسەر سێ بەش دابەش دەکات بەم جۆرە(٤٠):

١) زانستی هزرە لەخودی خۆیو بۆ خودی خۆی.

٢) فەلسەفەی سروشتی یا زانستی هزر.

٣) فەلسەفەی ڕۆح یا زانستی هزر کاتێك لەئەویترەوە گەڕاوەتەوە بەرەو خودی خۆی.

هیگڵ لەو بڕوایە دایە یەکەم حەقیقەتو گەورەترین حەقیقەت کە فەلسەفە لەکاتی پشکنینی بۆ ماددەی مێژوویی پێشکەشی دەکات ئەو هزرە بنەڕەتییە یە لەبارەی عەقڵ:( عەقڵ حوکمی جیهان دەکات، کەواتە مێژووی گەردوونیش بەشێوەیەکی عەقڵانی دێتە دی)(٤١). ئەم بۆچوونە یەقینییە لای هیگڵ گریمانکردنێکی زەینیانە نییە بۆ واقیع، بەڵکو ئەنجامی لێکۆڵینەوەیە لەمێژووی گەردوونی، لێکۆڵینەوەیەك لەسایەی فەلسەفەوە.





# ڕەخنەکانی هیگڵ لەفەلسەفەی ڕۆشنگەری

ئەو خاڵەی هیگڵ لەسەر فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا تۆماری دەکاتو لەسایەیەوە عەیبداری دەکات، ئەوەیە کە فەلسەفەی ڕۆشنگەری نەیتوانیوە لەناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ئایین بگات، نەیتوانیوە ئیدراك بەناوەرۆکی ڕاستەقینەی ئایین بکات، بەم شێوەیەش نەیتوانی لەو وشیارییە بگات کە لەلای مرۆڤدا بوونی هەیە، ئەو وشیارییەی مرۆڤ سەبارەت بەناکۆتایی بوونی خۆی.

لەڕاستیشدا فەلسەفەی ڕۆشنگەری بەتەنیا درزی نەخستە نێوان موتەناهیو نا موتەناهی، بەڵکو لەوەش زیاتر هات ناموتەناهی لەهەموو ناوەڕۆکێکی ڕاستەقینەی خۆی بەتاڵکردو ئەزموونی ڕۆحی مرۆڤیان بەتەنیا بۆ شارەزاییوئەزموونی هەستی موتەناهی گێڕایەوە(٤٢).

بێگومان کاتێك هەندێك لەفەلسەفەکارانی ڕۆشنگەری هەموو حەقیقەتێکی ئیلاهیانە ڕەت دەکەنەوە، یا ئەو کاتەی هاتن ڕەهایان وا وێناکرد گوایە بەتەنیا وێنەیەکی خەیاڵیو بۆشو بەتاڵە، ئەو کاتەی هاتن جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بوونی خواوەند تەنیا وەهمێكو میتۆلۆژیایەکە مرۆڤ بۆخۆی دایهێناوە، ئەو کاتە بەپێی بۆچوونی هیگڵ ئەم فەلسەفەکارانە لەکۆتاییدا گەیشتن بەنەزعەیەکی فۆرمالیستییانەی خاو، ئەوانە بەتەنیا هەندێك بوونەوەری موتەناهیان لەبەردەمدا مایەوە کە هیچ شتێك بەیەکەوەیان گرێ نادات، تەنیا کۆمەڵێك پێوەندی کۆمەڵایەتی لابەلاودەرەکیانە نەبێت، ڕەنگە هەر ئەوەش هۆی ئەوە بێت هەندێك لەخودی ئەم فەلسەفە کارانە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیان بە(مێگەلی مرۆڤایەتی)ناودێر کردووە، دیارە لەوەشدا مەبەستیان زیاتر ئەوە بووە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هاو شێوەی مێگەلی ئاژەڵ نمایش بکەن، ئەوانە لەو

باوەڕە دابوون تاکە فاکتەر کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەیەکەوە گرێ دەدات، فاکتەری سوودو بەرژەوەندیو قازانجی هاوبەشە، بەم جۆرەش ئەخلاق لەسەر دەستی فەلسەفەکارانی ڕۆشنگەری بوو بە ئەخلاقی کۆمەڵایەتی، خودی ئەخلاقی کۆمەڵایەتیش بوو بەفەلسەفەیەکی بەرژەوەندخوازی ڕووت، ئەو کاتەش لەڕوانگەی ئەم فەلسەفەکارانەوە ئایین بوو بەپێوەندییەکی کۆمەڵایەتی لەسەر هەمان پرنسیپی بەرژەوەندیو قازانج دامەزراوە، وەکو ئەوەی مرۆڤی ئیماندار بەتەنیا مرۆڤێکی بەرژەوەندخواز بێت گەرەکیەتی لەسایەی ئەو پێوەندیەی لەگەڵ خوا دەیبەستێت هەندێك دەسکەوتی ماددیو دونیایی بەدەست بێنێت.

بەهەرحاڵ هیگڵ پێی وایە ئەنجامی کۆتایی فەلسەفەی ڕۆشنگەری لەڕەخنە گرتن لەئیمانی ئایینی بەتەنیا دەسکەوتێکی پووچو بەتاڵ و بۆش بووە، چونکە ئەم فەلسەفەیە لەلایەك بەئاڕاستەیەکی ماددیدا ڕۆیشتو بڕوای بەهیچ ڕاستییەکی تر نەدەکرد، تەنیا ڕاستی موتەناهی نەبێت، لەلایەکی تریشەوە بەرەو ئەوە دەچوو نەزعەی بەرژەوەندگەرایی بالأدەستە بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیداو ئەستەمە بتوانرێت پێوەندییەك لەنێوان مرۆڤدا بێتەبوون، بەدەربێت لەقازانج و سوودو بەرژەوەندی.

کارکردنی فەلسەفەی ڕۆشنگەری بەم دوو ڕووگەو ئاڕاستەیە وا لەهیگڵ دەکات ڕەخنەیەکی زۆر توندی ئاڕاستە بکات، ڕەخنەی زۆر توند ئاڕاستەی هەردوو ڕەهەندی ماددیو بەرژەوەندگەرایی بکات، لەبەرئەوەی پێی وابوو ئەوە تەنیا فەلسەفەیەکی بچوکی لاتەریکەو مرۆڤ لەنێو زیندانی موتەناهیدا زیندان دەکات، بەبێ ئەوەی بتوانێت دەرگایەکی لەبەردەمدا والأبکات بۆ ئەوەی بتوانێت لەم جیهانە موتەناهییە تەسكو بچوکەدا بێتە دەر بەرەو جیهانی ناموتەناهی، دیارە مەبەستی بنەڕەتی هەریەك لەم دوو ڕەوتو بۆچوونەش وەکو ئەوەی هیگڵ پێی وایە، ئەوە بوو کە هەریەك لە ماتریالیزمو بەرژەوەندگەرایی کار بۆئەوە بکەن کە ئازادی وشیاری خودی







مرۆڤ دەربخەنو لەکۆتاییشدا وشیاری خودی تاکە کەس بگەیەنن بەحاڵەتی بالأبوون، بۆ ئەوەی بگات بەئاستی هزری هەمەکیو تۆتالیتاری.

ئەگەر بێین بمانەوێت لەم حوکمە تێبگەین کە هیگڵ بەسەر فەلسەفەی ڕۆشنگەری دەری دەکات، ئەوە ئێمە لەسایەی ئەوەوە دەتوانین ئیدراك بەدوو شتی تریش بکەین، لەلایەك ئیدراك بە بەهاکانی ڕەخنەی هیگڵ بکەین بۆ ئایین، لەلایەکی تریشەوە سنووری ئەم ڕەخنەیەمان بۆ دەردەکەوێت کە هیگڵ ئاڕاستەی ئایینی دەکات، ڕەنگە باشترین شت کە هیگڵ بۆئایینی کردبێت ئەوە بووبێت ئەو توانی لەو ئاسۆو ڕووگە باریكو تەسکانە دەربازی بێت کە فەلسەفەکارە فەرەنسییە مولحیدەکانی سەدەی هەژدەیەم بونیادیان نابوو لەسەری وەستابوون، ئەوانەی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە ئایین داهێنانێکی مرۆڤانەیەو گرووپی ئەکلیرۆسو دیکتاتۆرە سیاسییەکان دایانهێناوە، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی خۆیان لەسایەیەوە بپارێزنو درێژە بەدەسەڵاتی خۆیان بدەن، هەنجەتی هیگڵ لەکاتی ڕەخنە گرتنی لەم فەلسەفە ئیلحادییە ئەوە بوو کە ئایین ناوەڕۆکێکی ڕاستەقینانەی هەیەو بریتییە لەقۆناغێکی زۆر گرنگو زێدە بەها لەقۆناغەکانی پێشفەچوونی مرۆڤایەتیو بالأبوونیو هاتنە پێشەوەی یا کزبوونیو لاتەریکبوونی پەیوەستن بەهەندێك بارودۆخی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، خودی ئەم بارودۆخە کۆمەڵایەتییەش پەیوەستە بەهەندێك مەرجی مێژوویيو دیاریکراو.

## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی دووەم


١) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزءالاول، مصر،ص٢٠.

٢) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزءالاول،مصر، ص٢٠.

٣) هيغل و الفلسفة الهيغلية، جاك دونت، ترجمة- د. حسين الهنداوي، بلا سنة طبع، ص٧.

٤) تاريخ الفلسفة، القرن التاسع عشر، اميل برهيية، ترجمة- جورج طرابيشي، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٨٥، ص٢٠٦.

٥) اصول فلسفة الحق، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٩٦، ص١١٨.

٦) ئەپستمولۆژیا، ئایدیالیزم-ڕیالیزم، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، گۆڤاری ژیار، ژمارە(٤).

٧) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٤٦.

٨) گومانیئەپستمۆلۆژی، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، کاروان، ژمارە(١٤٨).

٩) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٤٨.

١٠) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٤٨.

١١) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٤٨.

١٢) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٤٩.

١٣) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٥٣.

١٤) مختارات هيغل، الجزءالأول، ترجمة- الياس مرقص، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٧٨، ص٨.









١٥) اصول فلسفةالحق، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د.امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٩٦، ص ١١٦.

١٦) مختارات هيغل، الجزء الثاني، ترجمة-الياس مرقص، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٧٨، ص٤٩.

١٧) اصول فلسفة الحق، المجلد الأول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٩٦، ص١١٤.

١٨) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الاول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٦٠.

١٩) فلسفة هيجل، عبدالفتاح الديدى، مصر، ١٩٧٠، ص٤٨.

٢٠) فلسفة هيجل، ولتر ستيس، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، مصر، ١٩٨٠، ص٨٥.

٢١) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزءالأول، مصر، ص٨٧.

٢٢) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزءالأول، مصر، ص٩٨.

٢٣) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزءالأول، مصر، ص٩٩.

٢٤) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٦٤.

٢٥) مختارات هيغل، الجزء الثاني، ترجمة- الياس مرقص، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٧٨، ص١٧٠.

٢٦) مختارات هيغل، الجزء الثاني، ترجمة- الياس مرقص، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٧٨، ص١٦٣.

٢٧) التاريخ والدولة، حسين هنداوي، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٩٦، ص٣٣.

٢٨) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٦٧.

٢٩) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هيجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٦٧.

٣٠) مختارات هيغل، الجزو الپانى، ترجمه-الياس مرقص، الگبعه الۆولى، بيروت، ١٩٧٨، ص١٧.

٣١) بارمندیسفەلسەفەکارێکی گریکی بووە، لە سەدەی شەشەمو پێنجەمی بەر لە زایینی لە باشوری ئیتاڵیا ژیاوە، ڕابەری قوتابخانەی ئیلی بووە.

٣٢) هیراکلیتس(٥٤٤-٤٣٨) فەلسەفەکارێکی ماددیو دیالیکتیکی گریکی بووەو خاوەنی کتێبی(لە سروشت)دایە.

٣٣) فلسفة هیجل، ولتر ستیس، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، مصر، ١٩٨٠، ص١٩١.

٣٤) فلسفة هیجل، ولتر ستیس، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، مصر، ١٩٨٠، ص٧٠٢.

٣٥) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هیجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بیروت، ١٩٨٣، ص٧١.

٣٦) هیجل، د. زکریا ابراهیم، الجزءالأول، مصر، ص٨٩.

٣٧) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هیجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بیروت، ١٩٨٣، ص٧٥.

٣٨) هیرالدیتلزنوك، بریتیە لەو شیعارو دروشمانەی کە پاشاو شازادە تورك‌و مەمالیکەکان هەڵیان گرتبوو، ئالێرەوە ئەو زانستە ناونرا زانستی رنوك، یا بە شێوەیەکی تر لەنێو هەندێك لێکۆڵینەوەی ئەنترۆپۆلۆژیدا بە تەوتەم ناودەبردرێت.

٣٩) فلسفة هیجل، ولتر ستیس، ترجمة، امام عبدالفتاح امام، مصر، ١٩٨٠، ص١٩.

٤٠) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هیجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بیروت، ١٩٨٣.

٤١) التاریخ والدولة، حسین هنداوي، الطبعة الأولى، بیروت، ١٩٩٦، ص٥٢.

٤٢) موسوعة العلوم الفلسفية، المجلد الأول، هیجل، ترجمة- د. امام عبدالفتاح امام، الطبعة الأولى، بیروت، ١٩٨٣.

٤٣)





## بەشی سێیەم

# هیگڵ و پرۆسەی مۆدێرنیزم

(بۆ ئەوەی فەلسەفە سەرهەڵبدات، پێویستە ئازادی هەبێت) هیگڵ

خوێندنەوەو هەڵکۆڵینی فەلسەفەکەی هیگڵ کارێکی ساناو ساکار نییە، چونکە خودی هیگڵ بۆخۆی فەیلەسووف‌و مرۆڤێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو هزرڤان‌و بیریارێکی مەزن‌و دەگمەن‌و پێشڕەو و ڕابەری نوێکەرەوەی هزری ئایدیالیزمی دیالیکتیکی بووە، ئەو ڕووگە فەلسەفییەی پێشتر هەریەك لەسوقرات‌و ئەفلاتوون‌و ئەرستۆی گریکی بۆ یەکەمجار وەکو میتۆدێکی فەلسەفی قووڵ بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی جیهان لەسایەی تێڕوانینێکی وردی ئایدیالیزمییانەوە خستیانە ڕوو.

ئایدیالیزمی دیالیکتیکیی مێژوویی هیگڵ میتۆدێکی فەلسەفی تەواو و هەمەلایەنە بووە، بۆیە وەکو ڕێڕەوێکی پێشقەچوونی ڕۆح خۆی نمایش دەکات، تێڕامان‌و خوێندنەوەی ئەم فەلسەفەیە، بە لێکۆڵینەوەیەك یا دووان تەواو نابێت، بەڵکو پێویستی بەچەندین توێژینەوەی وردوو هەمەلایەنە هەیە، تا بتوانرێت بە شێوەیەکی ماقووڵ نمایش بکرێت، ئەوەش لێرەدا کارێکی ئەستەمە، بۆیە ئێمە هەوڵ دەدەین ڕاوبۆچوونی هیگڵ لەسەر چەمکی مۆدێرنیزم لەلایەنی فەلسەفییەوە بخەینە بەرچاوو لەوە بگەین کە خودی مۆدێرنیزم وەکو پرۆسەیەکی تۆتالیتاریانەی مەعریفی، لەدیدو بۆچوونی ئەوەوە چۆن خۆی نمایش دەکات.

لەنێو کولتووری زانستیو مەعریفەی فەلسەفی مرۆڤایەتیدا، هیگڵ بوو بەو شوێنگەیەی کە تێیدا بۆچوونو تیۆرە سەرەکییەکانی فەلسەفەو ئەپستمۆلۆژیای مێژوویی لەبارەی کۆسمۆپۆلیتیكو مرۆڤو ڕۆحو عەقڵەوە سەریان هەڵداو بە شێوەیەکی نوێتر هاتنە بوون، ڕاستە هیگڵ درێژە پێدەری هەمان ڕێبازو ڕێچکەی ئایدیالیزمی مێژوویی بووە، بەڵام ئەو گۆڕانەی ئەو ئەنجامی داوە، بووە هۆی ئەوەی بەیەکجار ئایدیالیزم، لەسایەی پرۆسەی پێشفەچوونی دیالیکتیکیی مێژوویدا بە شێوەیەکی هەمەکیو تۆتالیتاریانە وەکو فەلسەفەی زاڵو باڵادەست بەسەر عەقڵی مرۆڤدا خۆی دەربخات. نووسینە مەزنەکانی لەبارەی ڕۆحەوە، گوایە خودێکە لەسایەی پرۆسەی بونیادی مێژووییەوە دێتە بوونو فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحو فەلسەفەی مافو وانەبێژییەکانی لەبارەی مێژووی جیهانەوە، بەشێك بوون لەکارە گشتییەکەی لەبارەی دیالیکتیكو فەلسەفەی مێژوویی ئایدیالیزمەوە، ئەو کارانەش لەکاتێکدا لەسەر دەستی ئەو هاتنە بوون کە جیهان بەرەو بە زانست بوون هەنگاوی دەناو گومان لەئایدیالیزم وەکو فەلسەفەو هزر گەیشتبووە لووتکە، بەڵام لەبەرئەوەی هیگڵ فەلسەفەکارێکی ئاسایی نەبوو، بۆیە ڕووگە فەلسەفییەکەشی هەر ڕووگەیەکی نا ئاسایی بوو، ئەوەبوو لەسایەی ئەم بۆچوونانەیەوە، بوو بە ڕابەری نوێی فەلسەفەی ئایدیالیزمی دیالیکتیکیی نوێ. لەبەرئەوەی فەلسەفەی ئایدیالیزمی دیالیکتیکی فەلسەفەیەکی گشتیگیرو هەمەلایەنەیە، بۆیە دیسان سانا نییە ئێمە بێین کار لەسەر یەك ڕوو، یەك چەمکی ئەم فەلسەفە دەوڵەمەندەی ئەو بکەین، چونکە فەلسەفەکە وەکو تۆڕێکی تۆتالیتاری سەرجەم دیاردە کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتیو عەقڵییەکان کۆنترۆڵ دەکات، بۆیە ناچار ماوە ماوە ڕۆدەچینە نێو کونو کەلەبەرەکانی تری فەلسەفەکەی، ئەوانەی ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە مۆدێرنیزمی فەلسەفیو فەلسەفەی دیالیکتیکی مێژوویی ئایدیالیزم. بەم شێوەیە، فەلسەفەکەی هیگڵ بازدانێکی نوێبوو بەرەو پێشەوە لەسەر ڕێگای فەلسەفەی بەر





لەزانستی، ڕووەو مەعریفەی فەلسەفی زانستی لەسایەی پرۆسەی پێشفەچوونی دیالیکتیکی فەلسەفییەوە، چونکە ئەو پێی وابووە خوێندن لەو سەردەمەی ئەودا، بۆ ئەوەیە فەلسەفە بگەیەنێتە ئاستی زانست، لەبەرئەوەی هیگڵ دەیزانی سەردەمەکەی ئەو، سەردەمی مەعریفەی زانستی بووە، بۆیە فەلسەفەکەی خۆی بەشێوەیەکی زانستییانە داڕشت.

تێڕوانینی هیگڵ بۆ چەمكو مێژووی فەلسەفە، تێڕوانینێکی جیاوازەو خاونی بەهاو تایبەتمەندییەکی تایبەتیشە، چونکە ئەو بەدوایەکدا هاتنی هزرەکانی لەنێو پرۆسەی پێشفەچوونی کاتیدا کردبوو بەیەکەم پرەنسیبی خۆی، ئەو پێی وابووە بە دوایەکدا هاتنی هزرەکان بە پێی سیستەمێکی پێشفەچوونی فەلسەفی، فۆتۆکۆپی کردنو بەدوایەکدا هاتنی گوتە لۆژیکییەکان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، کەواتە مێژووی فەلسەفە، بریتییە لەکردەی پێشفەچوونی هزرو لەناوەخۆ گرتنی ڕاستی، چونکە ناکرێت پەردە لەسەر ڕاستی ڕابماڵرێت، تەنیا لەنێو سەرجەم مێژووی هەمەکی مرۆڤایەتییانەدا نەبێت، هەر پێناسەیەکی تریش بۆ ڕاستی کە جیاوازبێتو مەزهەبێك یا بۆچوونێك دەیخاتە ڕوو لەلایەنی مێژووییەوە یەکلایەنەو ناتەواوە (١).

سەرهەڵدانو هاتنە ئارای هەر ڕێبازێکی فەلسەفی نوێ، هزر بەرز دەکاتەوە تا دەگاتە قۆناغی گوتەی باڵاتری لۆژیکی، چەمکی هیگڵ بۆ مێژووی فەلسەفە گریمانی گرانبەها لەخۆیەوە دەگرێت، وەکو بیرۆکەی پێداویستی پێشفەچوونی سروشتییانەی فەلسەفەو پشت بەستن بەمێژووی گشتی مەعریفە، بۆیە تێڕوانینی ئەو بۆ مێژووی فەلسەفە، تێڕوانینێکە جیاوازە لەئاست تێڕوانینی باوی سەردەمی خۆی، لەبەرئەوەی ئەو فەلسەفەکەی خۆی ناخاتە بەرانبەر فەلسەفەی فەلسەفەکارەکانی تر، تا بڵێت ئەوە ئەوانو ئەوەش منم، یا تا ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە ئەوان هەڵەنو منیش ڕاست، بگرە ئەو بۆچوونە بەلاوە دەنێت کە گەرەکیەتی مێژووی فەلسەفە بکات بە دووبەش، بەشێکیان ڕاستو دروستەو بەشێکی





تریشیان ناڕاستەو هەڵەیە، بەڵکو هیگڵ والە مێژووی فەلسەفە تێدەگات کە دەبێت لەسەر بنەمای پێشڤەچوونی بەردەوام بۆ ئاستی باڵاترو پێشەوەتر تێی بڕواندرێت، بۆیە لەنێو مێژووی فەلسەفەدا، بایەخ بە ڕاستیو لۆژیکیانەی بۆچوونە فەلسەفییەکان ناداتو پێیوایە مێژووی فەلسەفە، مێژوی کەڵەکە بوونی مەعریفەی فەلسەفییە بەسەرجەم بۆچوونو ڕێبازو تیۆرە فەلسەفییەکانەوە(٢). کەواتە بەم پێیەش بۆچوونو ڕێنماییەکانی بارمەندیس (٣) هەڵەو پووچ نین وەکو ئەوەی هەندێك لە فەلسەفەکارانی دواتر ئاماژەیان بۆ دەکرد، گوایە قسەی پڕووپوچو بێ مانایە، هەروها بۆچوونەکانی هیراکلیتس-یش (٤) هەڵەو پووچ نین، بگرە بۆچوونەکانی هیراکلیتس بە پێی ئەم بۆچوونەی هیگڵ نەوەك لەگەڵ بارمەندیس هەر دژکارو ناکۆك نییە، بەڵکو ئەویش لەناوە خۆیەوە دەگرێت، وێڕای ئەوەی ئەویش تێپەڕدەکاتو لێی ڕەت دەدات، چونکە بیرۆکەو هزری سەیرووڕەتو پێشڤەچوون بە کەڵەکە بوونی مەعریفەی مێژوویی یەك لەدوایەك بەندە، بۆیە مێژووی هەمەکی جیهان ئاوا ڕاستەوخۆ بەبێ مەبەست پێشڤەناچێت، بەڵکو لەسایەی ئامانجگەرایی هزر یا عەقڵەوە بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت، بۆیە مێژوو بەرجەستەکردنی لەسەرەخۆو هێمنی خودی هزرە لە نێو کاتدا(٥)، ئەوەش لاهووتییەکان بە بەڕێوەبردنو ئاراستەکردنی خوایانەی جیهانی ناوزەدی دەکەن، بۆیە کاتێك باس لەپێشڤەچوونی فەلسەفەو هونەرو ئایینو مێژووی سیاسی دەکات، ئەوە ئەم بیرۆکەیە دەخاتە ڕوو. ئەم تێڕوانینە، والەهیگڵ دەکات ڕاستەوخۆ دان بەوەدابنێت فەلسەفەی ئایدیالیزمی دیالیکتیکی، ئەو فەلسەفەیە کە سەرجەم بۆچوونو تیۆرو ڕێبازە فەلسەفییە کەڵەبووەکانی بەرلەخۆی لەناوەخۆی دەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵەرەوە بە سانایی دەتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامەی، فەلسەفەکەی هیگڵ ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ژێر کاریگەری دوو ڕووگەی فەلسەفی جیاوازو دوور لەیەك لەسەر ئاستی ماوەی کاتیدا، ئەوانیش ئایدیالیزمی گریکیو فەلسەفە ڕەخنەییەکەی کانت-ن (٦)، چونکە





پێگەو پرنسیپە سەرەکییەکانی فەلسەفەکەی هیگڵ هەمان پێگەو بنەمای بنەڕەتی ئایدیالیزمی گریکیو فەلسەفەی ڕەخنەیی کانت-ە.

هیگڵ لەنێو کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح)دا بە گاڵتەجاڕییەوە دەڕوانێتە فەلسەفەکارە ڕۆمانسییەکان کە خۆیان وەکو پەیام هێنەرێك نمایش دەکرد، گوایە ئەوان لەسایەی توانای عەقڵی خۆیانەوە سرووش لەهێزی میتافیزیکی کۆسمۆپۆلیتیکی وەردەگرن، فەلسەفەکارە ڕۆمانسییەکان بەردەوام خۆیان وا نمایش دەکرد، گوایە کاری ئەوان لێکۆڵینەوەو توێژینەوە نییە لەگەردوونو میتافیزیکاو عەقڵو خود، بەڵکو کاری ئەوان ڕادەربڕینو ڕێنماییکردنی کۆمەڵگایە، ئەوان گەرەکیان بوو، وشیاری خودی مرۆڤ، لەنێو گێژاوی تەمومژی فەلسەفەو سەفسەتەی سۆفستاییەوە ون بکەنو بشارنەوە، تا لەدواوەی ئەم کارەیانەوە، گورزی خۆیان بووەشێننە عەقڵو گومان لەکاریگەری ئەو عەقڵە بکەن، کاتێکیش مرۆڤ گومان لەعەقڵ دەکات، ئەوا فەلسەفەکارە ڕۆمانسییەکان وەکو مرۆڤی ڕەهاو باڵادەست دەردەکەون. هیگڵ ئەم ڕەخنانەی ڕاستەوخۆ ئاراستەی بۆچوونەکانی شلینگ (٧) دەکرد کە ڕابەرایەتی ئەم ڕەوتەی دەکرد، ڕەوتی ناعەقڵانییەتی فەلسەفی، هیگڵ گەیشتە ئەو باوەڕەی فەلسەفەکەی شلینگ فەلسەفەیەکی خەون ئامێزو خەیاڵاوییە، لەبری ئەوەی فەلسەفەیەك بێت پشت بەتێڕوانینی عەقڵانیو هزر ببەستێت، چونکە شلینگ بەبێ بوونی بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوون، باس لەبوونی حەدسێکی عەقڵی دەکات کە وەکو ڕوانینێکی ڕاستەوخۆ وایە، ئەم حەدسە بە مەعریفەی ڕاستەوخۆ هیچ پێوەرو ڕێکخەرێکی نییە، جگە لەوەی شلینگ ئەم حەدسە زەینییە بە مەعریفەیەکی بێ وێنەو دەگمەن ناوزەد دەکات، کەچی هیگڵ پێیوایە ئەم حەدسە، لەنێو زەینی مرۆڤدا بوونی نییە، چونکە تایبەتە بە تێڕوانینی خواوەندەوە بۆ ئافرێدەکراوەکانی خۆی (٨).

لەم ڕوانگەیەوە، چەمکی مۆدێرنیزم بەمانا فەلسەفییەکەی، ڕاستەوخۆ پشت تێکردن بوو لەم بۆچوونانەو ئەنگێزەکردنی گومان بوو لەئاست

ڕووگە کۆنەکانو ڕێگا خۆشکەربوو بۆ پشکنینو گەڕانو لێکۆڵینەوەی وردی فەلسەفی، چونکە زاراوەی مۆدێرن-نوێ ڕاستەوخۆ لەگەڵ زاراوەی کۆندا، دژکارە. نوێ بەردەوام مانای تێپەڕکردنە لەکۆن، بۆیە هیگڵ لەسایەی پرۆسەی دیالیکتیکەوە، چەمکی مۆدێرنیزم دەخاتە پێشەوەی کارەکەی خۆیو جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە مەعریفەی فەلسەفی لەبەر سروشتی خودی خۆی، مەعریفەیەکە ناکرێت ڕاستەوخۆ وەربگیرێتو بەدەست بهێنرێت، بەڵکو دەکرێت لەسایەی خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی بەردەوامەوە مرۆڤ پێی بگاتو بەدەستی بێنێت.

## زەمەنە مۆدێرنو تازەکان

کاتێك هیگڵ چەمکی مۆدێرنیزم بەکاردێنێت، ئەوا لەنێو سیاقی مێژوویدا، ئاماژە بۆ زەمەنە نوێیەکان یان زەمەنە تازەکان دەکاتو ئاماژە بۆ سێ سەدە دەکات، لەم سەدانەش زیاتر مەبەستی سەدەی دۆزینەوەی جیهانی نوێیە-دۆزینەوەی کیشوەری ئەمەریکا-و سەردەمی ڕێنیسانسو سەردەمی ڕۆشنگەرییە، ئەم سێ ڕووداوە پڕ بایەخو بەهایەی لەدەوروبەری ساڵی (١٥٠٠)ەوە دەست پێدەکەنو دەبن بەپێگەو پنتی بەیەکگەیەنەری نێوان سەدە ناوەڕاستەکانو زەمەنە تازەکان.

لەوانەکانیدا سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو، هیگڵ خودی ئەم زاراوانە بۆ ئەوە بەکاردێنێت تا وەکو جیهانی مەسیحی (ژێرمانی-ئەڵمانی) وەکو ئەنجامێکی سەردەمی شارستانییەتی گریکیو ڕۆمانی بخاتەروو. پۆلینکردنی مێژوو لەنێو سەمتی فەلسەفیدا پۆلینکردنو دابەشکردنێکی کلاسیکیو باوە، ئەویش تێڕامانێکە لەسێ گۆشەنیگاو ڕەهەندی جیاوازەوە بۆ پرۆسەی پێشڤەچوونی مێژوویی، سێ ڕەهەند واتا سێ بەش، بەشێك بۆ مێژووی کۆنی ڕابردوو دەگەڕێتەوە، بەشێکی تریش بۆ سەدە ناوەڕاستەکان،





بەشەکەی تریش سەردەمو زەمەنی نوێیە-مۆدێرن، ئەم سێ ڕەهەندەی تێڕامان لەمێژوو، لەوەوە سەرهەڵدەدات کەخودی چەمکی کات تەنیا لەسێ ڕەهەندی کاتییەوە تێی دەڕوانرێت-ڕابردوو، ئێستا، ئایندە-بەڵام کاتێك بیریارێکی مەزنی وەکو هیگڵ کار لەسەر مێژوو دەکات، ئەوە ئایندە لەنێو ئەم پرۆسە مێژووییەوە بەلاوە دەنێتو ڕەهەندەکانی کات بەسەر مێژووی تێپەڕ دابەش دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیایە لەوەی ئایندە شتی نوێو زۆری شاردراوە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتو بەهیوایەکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. ئەم پرۆسەیەی دابەشکردنی مێژوو، ئەم پۆلینکردنە بۆ سێ بەشی مێژوویی جیاجیا لەیەکتریو لەدوایەك هاتوو، ئەستەم بوو ئەنجام بدرێتو بچێتە سەر، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە زاراوەی وەکو زەمەنە نوێیەکان یان زەمەنە تازەکان یان جیهانی نوێو جیهانی تازە هاتنە بوون، سەرهەڵدانی ئەم چەمکە تازەو نوێیانەی کات، ڕێگا خۆشکەربوون لەبەردەم هیگڵ لەبەرئەوەی ئەم زاراوانە کاتێك داهێنران ئاماژە بوون بۆ دابڕانو پچڕان لەگەڵ ڕابردوودا، کاتێکیش ئێستا لەڕابردوو دادەبڕێت، ئەوە پێویست بەوە دەکات، خاوەنی ناسنانەو مانای تایبەتی خۆی بێت، بۆیە سەردەمی نوێ هاتە بوون، سەردەمێك لەڕەگوڕیشەوە لەئاست ئەو سەدەیەی بەرلەخۆیدا نوێ و تازەیەو خاوەنی چەمكو ماناو زاراوەو زانستو مەعریفەی فەلسەفی تایبەت بەخۆیەتی.

سەردەمی نوێ وەکو زاراوەو مانا، لەنێو کولتووری خۆرئاوای مەسیحیدا، بەردەوام ئاماژە کردن بوو بۆ زەمەنێکی ئایندەیی نادیار کە هێشتا نەهاتووەو دەستیشی پێ نەکردووەو دەستیش پێناکات، تەنیا لەدوای ئەو ڕۆژەوە نەبێت کە ڕۆژی موحاسەبەکردنەو دەلالەت لەجیهانێکی نوێ دەکات، جیهانی دوای حیسابو پاداشتو سزا، ئەم تێڕوانینە ئایینیو لاهووتییە باڵی بەسەر بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەورووپای خاوەن کولتووری مەسیحیدا کێشابوو، ئەوەبوو شلینگ کاتێك باسی سەردەمەکانی جیهان دەکاتو پۆلینیان دەکات، ئاماژە بۆ ئەم بۆچوونە لاهووتییە دەکاتو





حیسابی بۆ دەکات، بەڵام چەمك و تێڕوانینی عیلمانیو نالاهووتی بۆ سەردەمی تازەو نوێو زەمەنی ئایندەیی دان پێدانان بوو بەدەست پێکردنی ئەو ئایندەیە. ئاماژەکردن بوو بۆ سەردەمێك کە لەداهاتوودا دێتو باوەشی بۆ ئایندەی نوێ دەکاتەوە، ئەم هەستکردنە بەدابڕانی سەردەمی نوێ لەئاست سەردەمی ڕابردوودا کە لەساڵی (١٥٠٠)ەوە دەست پێدەکات، بەم شێوەیەی گۆڕانو نوێکاریی ڕیشەیی تێی نەدەڕوانرا، تەنیا لەسەدەی هەژدەیەمدا نەبێت، واتا کاتێك فەلسەفەکارێکی وەکو هیگڵ ئاوڕی لەمێژووی دواوەی خۆی دایەوەو لەسایەی فەلسەفەی مێژووەوە، سەرلەنوێ مێژووی بەپێی دوالیزمی کاتی خوێندەوە، بۆیە کاتێك بیریارو فەلسەفەکاران، گومان لەم مێژووە دایاندەگرێت، ئەنگێزەی پرسیاری پڕ ماناو ئاراستەکار دەکەن بۆیە کوسیلك بە ئاشکرا دەپرسێت:( لەکەیەوە ئەو زەمەنەی تێیدا گوزەران دەکەین، بەزەمەنی نوێ ناوزەد کراوە؟)(٩). ئەم پرسیارەی کوسیلك پرسیارێکی سادە نییە تەنیا مەبەستی ئەوە بێت دەستنیشانی ئەم سەردەمە بکات، بەڵکو زیاتر مەبەست ئەوەیە مانای دواوەی ئەم پرسیارە بخوێنرێتەوەو بخرێتە ڕوو.

ئێمە لەکاتی ڕاڤەکردنی هەر گوتارێکی ئاراستەکراودا، دوو مانا بەدی دەکەین، مانای دەربڕاوی ڕوونی نێو گوتارەکانو مانای حەشاردراوی نێو ووشەو گوتەکان، بۆیە لەسایەی ئەم پرسیارەوە، دەتوانین ئەوە ڕوون بکەینەوە کەچۆن وشیاری مێژوویی دەربڕراوە بەچەمکی زەمەنە نوێیەکان یا زەمەنە تازەکان، هەڵگری پێکهاتەی مانا بوون بۆ تێڕوانینێك کە ئاڕاستەی فەلسەفەی مێژووی پێ دەکرێت بە شێوەیەك مرۆڤ گەیشتە ئەو باوەڕەی لەسەرووی لووتکەی مێژووی تۆتالیتارییانەی مێژوو وەستاوە، بۆیە لەسەردەمی هیگڵ-ەوە ئەو بۆچوونە باڵی بەسەر فەلسەفەی ئایینیو نالاهووتیدا کێشابوو کە زەمەنی نوێ سەرجەم مێژووی کۆن دادەپۆشێت، ئەوەتا خودی هیگڵ بۆخۆی دەڵێت:( سانایە ئەوە بەدی بکەین زەمەنەکەی ئێمە زەمەنی لەدایکبوونو گواستنەوەیە بەرەو سەردەمێکی نوێ، ڕۆح







لەسەر لێواری گۆڕاندایە، لەگەڵ جیهانی شتو ئەو هزرانەدا کە تائێستا باڵادەست بوون دابڕاو، لەسەر لێواری ئەوەشدایە بەرەو نێو قووڵایی ڕابردوو فڕێی بدات، لەڕاستیدا ڕۆح ناحەسێتەوە، چونکە لەبزاڤێکدایە بەردەوام بۆ پێشەوە هەنگاو دەنێت، بەڵام لێرەشدا هەمان شت ڕوودەدات کە لەکاتی لەدایکبوونی منداڵدا ڕوودەدات، دوای ماوەیەکی زۆر لەدەرخواردنێکی بێدەنگ، هەنگاوی یەکەم بەدوایەکدا هاتنی ئەو پێشکەوتنە تێکدەشکێنێت کە تەنیا گەشەکردنێك بوو، بازدانێك لەچۆنایەتیدا ڕوو دەدات- ئەوکاتەش منداڵ لەدایك دەبێت- ئەو ڕۆحەش کە پێکدێت لەسەرەخۆو بە بێدەنگی شێوەی نوێی خۆیوەردەگرێتو دەگرێتەبەر دواتریش هەندێکیان لەدوای هەندێکی تر دێنو پارچەکانی بونیادی جیهانی کۆن پێکدەهێنن. هەژانی ئەم جیهانە تەنیا لەسایەی چەند نیشانەیەکی تایبەت ئاماژەی بۆ دەکرێتو خۆی دەردەخات، ئەو بێزارییەی کە سیستەمی شتە بونیادنراوەکان دەبڕێت، هەستێکی نادیارو شاراوە، ئاماژەیەکی دڵخۆشکەرە بەو جیهانە نوێیەی کە دەخشێت).(١٠) بەم شێوەیە دەبینین، دوو پرۆسەی فەلسەفی هاوشانی یەکتری بەڕێگادا دەڕۆن، یەکەمیان: دەستنیشانکردنی زەمەنی تازەو دابڕانیەتی لەڕابردوو و زەمەنە تێپەڕەکان. دووەمیان: شیکارکردنی سەردەمی ڕابردووە، کاتێك سەردەمی ڕابردوو دیاری دەکرێت، سانایە ڕاڤە بکرێتو توێژینەوەی مێژوویی لەسەر ئەنجام بدرێت، بۆیە دەستنیشان کردنی زەمەنی تازەو شیکارکردنی سەردەمی ڕابردووو هاوشانی یەکتری بوونو لەسایەی یەکەوەش ئەنجام دران، هیگڵ-یش ئەو فەلسەفەکارە بوو کە ئەم کارە مەزنەی گرتە ئەستۆی خۆی، لەمیانەی ئەم هاوشانییەشدا ڕووداوە مێژووییەکان پێشکەوتنی بەردەوامیان بەخۆیانەوە بینی، چونکە چەمکی زەمەن چەمکێکە وەستانو چەقیەستن قەبووڵ ناکات، تێڕوانین بۆ مێژوو گوایە سەیرورەتێکی یەکگرتوو و تووندو تۆڵی کێشەکانە، بۆ ئەم سەردەمە نوێیانە دەگەڕێتەوە.

دیاره ئـەم جـیهانە نوێـیە، ئـەم جـیهانە تازەیـە لەئاست جـیهانی کۆنـدا لەهـەموو مەسـەلەو بابەتـێکدا جـیاوازە، چونکە والأکردنی دەرگایە لەئاست ئایـندەو سـەر لـەنوێ هـیوایە بەدەسـپێکی سـەردەمێکی مێژوویی نوێ، بۆیە وشـیاری مـێژوویی، مۆدێرنـیزم وەکـو بابـەتو مەسـەلەیەك لەنـێو خۆیـدا دەگرێـتو دەستنیشـانی زەمـەنی نـوێو زەمـەنی ئێستای هاوسەردەم دەکات، زەمـەنی هاوچـەرخ وەکـو مـێژووی زەمـەنی ئێسـتا، شـوێنێکی دیارو بەرچاو لەنـێو ئاسـۆی زەمەنـە تازەکـاندا دەگرێـت، ئـەوەش هـیگڵ بـەو ڕووگەیـە ئاراسـتە دەکات بگاتە ئەو باوەڕەی زەمەنی ئێمە بریتییە لەزەمەنی ئێستاو زەمـەنی هاوچـەرخی خـودی خۆشـی لەگـەڵ سەردەمی ڕۆشنگەریو شۆڕشی فەرەنسـیدا دەسـت پـێدەکات، واتـا ئـەو زەمەنـەی تێـیدا خـەڵکی وا ژیـاون بـتوانن تواناکاری خۆیان بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر لەلایەنی عەقڵو هزرو داهێـنانی تـیۆری نـوێ بسـەلمێنن، ئـەو سـەلماندنەش ئـەوە ئاشکرا دەکات کە ئـــەوان لەئاســـت ســـەردەمی ڕابـــردووی تێـــپەڕی خۆیانـــیان ڕەتـــداوەو بەشـێوەیەکی فـراوان لەسـایەی بـازدانی ئەپستمۆلۆژیو هزریـیەوە بەپـێش سـەردەمەکەی خۆیـان کـەوتوون، بۆیـە سـەدەی هەژدەیەم لەلای ئەو دەبێتە زەمـەنی لەیـەکتر جـیا کـردنەوەو دابـڕانی بـەها مەعریفیو فەلسەفییەکان، بۆیـە دەڵێـت:( ئـەم ڕۆشـنایییە جوانـە لـەقۆناغی کۆتـایی مـێژوومان نـزیك دەکاتەوە، لەجیهانێك کە جیهانی ئێمەیە).

بـــەمجۆرە ئایـــندەو زەمـــەنی نـــوێ لـــەلای هـــیگڵ هەڵگـــری پەیامـــێکی ڕۆشـنکەرەوەو جوانـە، لـەپاڵ ئەوەشـدا ڕوانیـنی ئـەو بـۆ زەمـەنی ئایـندە، ڕوانیـنێـکی گەشـبینەو ئایـندە بـەمولکی خـۆی دەزانێـت، کەواتـە زەمەنـە نوێـیەکان، زەمەنـێکن ڕووەو کۆتـایی مـێژوو دەچـن، کۆتایی مێژووش لەلای هـیگڵ مەسـەلەیەکی فەلسەفی قووڵ نییە، بەقەد ئەوەی پێشبینی کردنێکە بـۆ بالأدەسـتی ڕەگـەزێکی دیاریکراو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زۆر چاك دەزانێت سـەرهەڵدانی زەمـەنی نـوێ چ ماناو دەلالەتو گۆڕانێکی مەزن لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێـت، بۆیـە دەڵێـت:( سـەرەتای ئەم رۆحە نوێیە بریتییە لەئەنجامی





تێکشکاندنێکی فـراوانی کۆمەڵـێك شـێوەی کولـتووری جـیا جـیا-لەدوای ئەم ڕێگـا ئـاڵۆزەو پـڕ لـە مـاندوو بـوونو ناتەباییە، پاداشتیش دیسان هەر فرەو جـیاوازە)(١١). لـێرەدا هـیگڵ زۆر چـاك هەسـت بـەو مەترسـییە دەکـات کـە زەمـنی نـوێ لەگـەڵ خۆیـدا هەڵی دەگرێت، زەمەنی نوێ سەرجەم کولتوورە بالأدەسـتەکان هەڵدەوەشـێنێتەوەو تێکدەشـکێنێت، تێکشـکاندنی کولـتووری بالأدەسـت، واتـا پووچـەڵکردنەوەی ئـەو گوتـارەی لـەدواوەی ئەم کولتوورەوە کـار دەکـاتو ئاراسـتەی دەکـات، لەهـەمان کاتیشـدا ئـەو پێوەندیـیانەش تێکدەشـکێنێت کـە خـودی ئـەم کولـتوورە بالأدەسـتانەی لەسەر بونیادنراوە، نـوێ بـەمانای بـەلاوەنانی کۆنـە، بـەلاوەنانی کـۆن واتـا ڕەتکـردنەوەی ئـەو مـێژووە تێـپەڕەی کـە لەنـێو کتێـبی مەزنو گەورەدا نووسراوەتەوەو لەسەر تاخچـەی کتێـبخانەکاندا ڕێزکـراونو هـیچ کاریگەرییەکـیان نـەماوە، تەنـیا وەکـو پاشمــاوەی زەمەنــێکی ڕابــردوو و تێــپەڕ ســەیر دەکــرێن. دیــارە سـەرهەڵدانی هـەر زەمەنو سەردەمێکی نوێ، پێویست بە شۆڕشێکی هزریو فەلسـەفی دەکـات، تـا ئـەو ڕووگـەو ئاراسـتانە دیـاری بکـات کـە پێویسـتە گۆڕانەکان لەسەری بڕۆن.

هـیگڵ ئەوکاتەی وەسفی وێنەی زەمەنە نوێیەکان یان جیهانی نوێ دەکات دەڵێـت:( ئـەوەی مەزنێتـیی ئـەم سـەردەمەمان دروسـت دەکات ئەوەیە، کەوا لەسـەر دان پـێدانان بـەئازادی بونـیادنراوە، وەکو ئەوەی ئازادی خاسیەتێکی رۆح بێـت، ڕاسـتییەکە خـودی خـۆی پـێکی هێـناوە)(١٢). لـێرەدا گوتـەو زاراوەی خـود بەرلەهـەمو شـتێك چـوار دەلالـەتو مانـای جـیاواز لەخۆیەوە دەگرێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١) تاکێـتی: ئـەویش لەنـێو جـیهانی نوێـدا پەیوەسـتبوونە بەشـێوەیەکی تایـبەتی ناموتـەناهی، بەشێوەیەك مافی ئەوەی هەیە داوای هەمو ئەوشتانە بکات کە چاوی تێبڕیون.

٢) مـافی ڕەخـنەگرتن: یەکێك لەپرنسیپەکانی سەردەمی نوێ ئەوەیە داوا لـەتاك دەکات بەهـیچ شـتێك ڕازی نەبێت، ئەگـەر پاساوی تەواو ڕازیکەری





بۆنەبێت، بۆیە ڕەخنەگرتن لەنێو زەمەنی نوێدا، دەبێتە بەشێك لەمافەکانی تاك، ئەو مافانەی بەدرێژایی مێژوو لەمرۆڤ قەدەغەو تابۆ کرابوو.

٣) سەربەخۆیی کار: یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی سەردەمە نوێیەکان بۆ مسۆگەرکردنی ویستی ئەنجامدانی کارەکان پێویستە.

٤) فەلسەفەی ئایدیالیزمی: هیگڵ پێیوایە کاری زەمەنە نوێیەکان لەوەدایە کە فەلسەفەی ئایدیالیزمی هەست بە بوونو کامڵبوونی خۆی بکاتو بەپێی بۆچوونەکانی خۆی واقیع ڕاڤە بکات، هەر ئەم فەلسەفەیەشە، کەوا پرنسیپی خودێتی دەسەپێنێت. پرنسیپی خودێتی کەبریتییە لەچاکسازیو ڕۆشنگەریو شۆڕش.

## مۆدێرنیزم......هزری نویٚو زمانی نویٚ

هەموو پرۆسەیەك بۆ نوێگەری لەناوەخۆیدا پشت بە دوو توخمو ڕایەڵی سەرەکی دەبەستێت، ئەوانیش هزرو زمانن، ئەگەر هزر بەرهەمهێنەری گوتار بێت، ئەوا زمانیش دەربڕی ئەم گوتارەیە، هزری مۆدێرن گەرەکیەتی شکست بە گوتاری بالأدەستی ڕابردوو بێنێت، کەخۆی لەسایەی گوتاری مانەوەوە دەردەخاتو ناتوانێت هاوشانی واقیعی نویٚ بەرێگادا بڕوات، بۆیە هیگڵ هات لەنێو پرۆسەی نوێگەریدا، بەدوای زاراوەو زمانێکی نوێدا گەڕا، تا بتوانێت هزری نوێی ئایدیالیزمی دیالیکتیکی لەمیانەی ئەم زمانە نوێیەوە بخاتە ڕوو، بۆیە لە پاڵ زاراوەو دەربڕینو گوتەی وەکو زەمەنی نویٚو زەمەنی تازەدا، سەدەی هەژدەیەم چەندین چەمكو زاراوەی جیاوازو فرەمانای دارشتو داتاشی کە تا ئەمڕۆش توانیویانە چەمكو مانای خۆیان ببەخشنو خاوەنی دەلالەتی خۆیان بن، زاراوەو چەمکی وەکو عەقلاٚنییەت، پێشکەوتن، ئازادی، شۆڕش، قەیرانو گۆڕان، پێشڤەچوون، ڕۆحی





سەردەم......تاد. هەموو ئەم چەمکانەش دەربڕی بزاڤو جووڵەی بەردەوامنو جەختیش لەسەر بزاڤکردن دەکەن، چونکە دژی چەقبەستنو جێگیربوونو وەستانن، ئەم زاراوەو زمانە نوێیە بوون بەکلیلی دەرگای فەلسەفەکەی هیگڵ، چونکە ئەگەر سەرلەنویٚ ئەم زاراوانە بخەینەوە نێو مێژووی چەمکەکان، ئەوا ئێمە ڕاستەوخۆ پەنجەمان دەخەینە سەرئەو مەسەلانەی وشیاریی مێژویی نویٚ دەریان دەبڕێتو دەیانخاتە ڕوو، وەکو چۆن ئەوەی خۆی بەچەمکێکی جیاواز لەزەمەنە تازەکان دەردەبڕێت، گوایە تایبەتە بەکولتووری خۆرئاوای مەسیحی، لەبەرئەوەی خواستنی پێوەرو پێوانە نوێیەکان لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر مەسەلەیەکە بە ئارەزووی نوێگەرەکانو پرۆسەی پێشڤەچوونی مۆدێرنیزم نییە، بەڵکو ئەوە مەسەلەیەکی داسەپاوەو مۆدێرنیزم ناچارە لەهەر سەردەمێکدا پێوەرو پێوانەی تایبەت بەخودی خۆی لەنێو سەرجەم بوارە هزریو کولتووریو ئیستاتیکییەکاندا دابهێنێت، لەبەرئەوەی ناکرێت نوێگەری پشت بەخودێکی تری جیاواز لەخودی خۆی ببەستێت، تا بەهای خودی خۆی دەربخات، کەواتە دەبێت بۆخۆی دینامیکییەتی سەیروورەتی هەوڵو کۆششەکانی خۆی ڕاڤە بکات، تا جێگیرتر بێتو دەستنیشانی هەڵوێستی خۆی لەئاست خودی خۆیو دەوروبەردا بکات، ئەوەش مەسەلەیەکە نوێگەری بەردەوام بەدوایەوە وێڵە، لەبەرئەوەی سەردەمانێکی زۆرە زاراوەی نویٚ لەئاست زاراوەی کۆندا خۆی نمایش دەکات، واتا نویٚ- کۆن دەبن بە دوولایەنی لێك دانەبڕاوی یەك مەسەلەو بابەت، دوالیزمێکی هاوشانو ناتەبا، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەنێو ئەم سەمتەشدا، زاراوەی ئێستاو نویٚ بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێت تا هێزێکی ئەفسووناوی لەڕادەبەدەر بەخۆیان ببەخشن، بۆ ئەوەی خۆیان وانمایش بکەن گوایە لەئاست زەمەنی ڕابردووی تێپەڕدا جیاوازن.

هیگڵ دەڵێت:( ئەگەر هەندێك هەوڵ و کۆششی ڕابردوو بەلاوە بنێین، ئەوە مافی داواکردنی موڵکدارێتی مرۆڤ-بەلایەنی کەم لەلایەنی تیۆرییەوە-

بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە)(١٣). مەبەستی هیگڵ لەموڵکدارێتی کردنی مرۆڤ، موڵکدارێتی کردنی جەستەو رۆحی مرۆڤە کە لەسەردەمو سەدەکانی ڕابردوودا ئەو جەستەیە بەموڵکی هێزی باڵادەستی میتافیزیکای گەردوونی دادەنراو بەم شێوەیەش مامەڵەو ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرا، بەتایبەتیش کولتووری ئایینی یەهوودیو مەسیحی، ئەم بۆچونەیان پەرەوپێداو جەختیان لەسەر دەکردەوە، هەستکردن بەموڵکدارێتی جەستە لەلایەن مرۆڤەوە، لەگەڵ ئەم پرۆسە نوێگەرییە تۆتالیتارییەدا سەری هەڵدا کە سەرجەم لایەنە ژیارییەکانی گرتەوە، بۆیە جەستە پێویست بوو لەمیانەی شێوازی کارکردنی تایبەتەوە خودی خۆی دابمەزرێنێت، جەستەی مرۆڤ ئەو جەستە ئامادەو نا ئامادەیەی بەردەوامی مێژوو بووە، واتا جەستە لەیەك کاتدا ئەگەرچی ئامادەبوونی هەبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام لەپەراوێزی ڕووداوەکاندا بووەو جۆرە نائامادەبوونێکی نمایش کردووە، چونکە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان لەسەرجەم قۆناغو مێژوی ڕابردووی بەرلە هیگڵ و ماوەیەکیش دواتر سانسۆرو تابۆی بەردەوامیان خستووەتە سەر ئەم جەستەیە.(١٤)

لەبەرئەوەی هیگڵ بیریارێکی تا سەر ئێسقان ئایدیالیستییە، بۆیە ئەوە ڕەتدەکاتەوە فەلسەفە ڕەنگدانەوەی واقیعی کۆمەڵایەتی بێت، ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی مێژوو دیاری دەکات، لای ئەو، فەلسەفە بەشێوە ئایدیالییەکەی لەسەرووی کۆمەڵگاوەیەو پەیوەستی رۆحی ڕەهای گەردوونییە، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو مێژوونووسێکی فەلسەفی، بایەخێکی زۆریش بەڕووداوە مێژووییەکان دەدات، چونکە پێیوایە ئەم ڕووداوانە مەبەستی زۆر لەخۆ دەگرنو ئاراستەکراون، بۆیە هەوڵدەدات یەکێتی نێوان ڕێبازە فەلسەفییەکانو بارودۆخە مێژووییەکان بدۆزێتەوەو دیاری بکات، لەگەڵ ئەوەی فەلسەفە بۆ خۆی لەڕوانگەو تێڕوانینی ئایدیالیزمی ڕەهاوە، بریتییە لەناوەڕۆکی جەوهەری سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراو، کەواتە دەکرێت لەسایەی خوێندنەوەی فەلسەفەی سەردەمێکی دیاریکراودا، ئێمە





لەناوەڕۆکی ئەم ڕەوتو ڕووگانە بگەین کە وەکو تیۆری فەلسەفیو هزری باڵادەست، سەردەم کۆنترۆڵ دەکەن، بۆیە فەلسەفە بۆ دیاریکردنی بارودۆخی هزری سەردەمێك لەخانەی پێشەوەی ئەم فاکتەرانە دایە، ئەم دوو بۆچوونە دژکارە سەبارەت بەشوێنگەی فەلسەفەو باڵا دەستی عەقڵی ڕەهای گەردوونیو ئاراستەکردنی مێژوو، ئەم دوو ڕەوتە مێژووییو ئایدیالیستییە دژکارە، یا ئەم ڕاڤەکردنە ئایدیالییە بۆ کردارە مێژووییەکانو گێڕانەوەیان، بۆ چەمکێکی ئەنتۆلۆژی لۆژیکی لەشێوەی هاوشان بوون پێشڤە دەچێت، مەسەلەیەکی حەتمی بوو لەنێو بۆچوونەکەی هیگڵ-دا لەبارەی لۆژیکەوە، ئەوەش خاڵی دەسپێك بوو لەیەکێتی بوونو هزرو لەوەوە دەست پێدەکات، ئەو دیالیکتیکەی هیگڵ دایهێنابوو بەردەوام پاڵی پێوەدەنا تاوەکو پشت بەڕووداوە مێژووییەکان ببەستێتو لەئەنجامی ئەم ڕووداوە مێژووییانەشەوە، بڕیارە لۆژیکییەکانی خۆی دەربکات، بۆیە ئەو وا دەیڕوانییە ڕێبازە فەلسەفییەکان نەوەکو هەر بەتەنیا گوایە ئەنجامی بزاڤی خودی هزری ڕەهان، بەڵکو بەوەی دەربڕی عەقڵیو پێداویستی پێویستن بۆ ئەنجامدانی گۆڕانی ڕیشەیی لەنێو ژیانی کۆمەڵایەتیدا، ئەم گۆڕانانەش بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە ڕاستەوخۆ گۆڕانە لەرۆحی زەمەن، یان گۆڕانە لەرۆحی گەلان، ئەم گۆڕانانە پەیوەستی پرۆسەی پێشڤەچوونن، کە مۆدێرنیزم لەنێو سەرجەم بوارە ژیارییەکاندا دایان دەهێنێت.

هیگڵ کاتێك دەڕوانێتە سۆفیستەکانو سوقراتو فەلسەفەی ڕۆشنگەریو زیاتر ڕۆدەچێتە نێو سەرچاوەو ڕەگوڕیشەی مێژوویی ڕواقیو ئەبیقۆریو گومانکارە ڕۆمانییەکان، دەگاتە ئەو باوەڕەی سەرجەم ڕێبازە فەلسەفییەکان سەرەڕای جیاوازیو زۆریشیان، بەڵام دەربڕی یەك ڕەوتن ئەویش ئەوەیە والە رۆح بکەن لەنێو خودی خۆیدا، گوێ بەهیچ شتێك نەدات کە لەواقیعدا بوونی هەیە.

کاتێك تیۆدۆر ئۆیزرمان-ی هزرڤان، ئەم بابەتە لەلای هیگڵ ڕاڤە دەکات‌و دەگاتە ئەم ئەنجامە، پرسیاری ئەوە دەکات:( ئایا ئەم ڕەوتە لەکوێوە سەرهەڵدەدات؟ ئایا ڕەگ و ڕیشەی ئەم ڕەوتەلەنێو پێشفەچوونی خودی فەلسەفەدایە؟ یان لەنێو ئەم گۆڕانانە دایە کە لەنێو بونیادی کۆمەڵگادا ڕوودەدەن؟)(١٥) هیگڵ ئەم بۆ چوونەی دوایی لا پەسندترە، چونکە ئەو ئاماژە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی دەکات، ئەم دارمان‌و هەڵوەشاندنەوەیەش وەکو دارمان‌و هەڵوەشاندنەوەی جەستەی بایۆلۆژی ڕاڤە دەکات.

ئەم تێڕوانینە دیالیکتیکییەی هیگڵ بۆ سەیرورەت و پێشفەچوون، بووە هۆی ئەوەی پشت بەم بەراوردکارییەی نێوان جەستەی بایۆلۆژی‌و دەوڵەت ببەستێت، هیگڵ یەکێکە لەو فەلسەفەکارانەی پێیوایە تایبەتمەندی‌و کاروفەرمانی دەوڵەت لەتایبەتمەندی‌و کاروفەرمانی جەستەی بایۆلۆژی زیندووی مرۆڤ دەچێت، لەو باوەڕشدایە دەوڵەت مرۆڤ ئاسا لەدایك دەبێت‌و پێدەگات‌و گەورە دەبێت، لەدواییشدا پیر دەبێت‌و دەمرێت(١٦)، هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی لەم ڕوانگەیەوە لەلای ئەو تێی دەڕوانرا.

## دابڕان‌و مۆدێرنیزم

مەبەست لەدابڕان بە چەمکە باشلار ییەکەی دیاریکردنی پێوەندی پەتەوی نێوان مێژوو و ئەپستمۆلۆژیایە، بەلام ئێمە کاتێك لەم توێژینەوەیەماندا چەمکی دابڕان بەمانا باشلار ییەکەی بەکاردەهێنین، ئەوە لەپاڵ ئەم مانایەشدا، مەبەستمان لەدابڕان وەکو چەمکێکی هزری ئەوەیە دوو قۆناغ لەیەکتری جیا بکەینەوە، قۆناغی یەکەمیان قۆناغی پراکسیس کردنی ئایدیالیزمە وەکو فەلسەفەیەکی هەمەکی‌و گشتگیری







ڕاستەوخۆی ڕۆژانەو مۆرکێکی ئایدیۆلۆژی لەخۆیەوە گرتووە، قۆناغی دووەمیان قۆناغی دارشتنی تیۆرییانەی ئەو پرنسیپ‌و بنەما گشتییانەی ئایدیالیزمە لەسایەی دیالیکتیکەوە، ئەوەش دابڕانێك بوو هیگڵ لەنێو مێژووی دووری ئایدیالیزمدا ئەنجامی داو ئایدیالیزمی لەم ڕەگوڕیشە کۆنەی خۆی دابڕی‌و بە بەرگێکی نوێ لەسایەی چەمکی بازدانەوە خستییەوە ڕوو، کەواتە دابڕان بریتییە لەوماوە جیاکەرەوەیەی نێوان هەردوو قۆناغ، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاگاداری ئەوە بین کەچەمکی دابڕان هەرگیز بەمانای ئەو ماوە کاتییەی نێوان هەردوو قۆناغ نایەت، جگە لەوەی بەمانای ئەو گۆڕانە خێرایانەش نایەت کە دەبنە هۆکاری داهێنانی مەسەلەو بابەتێکی نوێ، بەڵکو دابڕان بریتییە لەڕووگەیەکی ئاڵۆزو تێکەڵاوی هەمەلایەنەو دەبێتە هۆکاری بەرهەمهێنانی قۆناغێکی نوێ‌و جیاواز لەمێژووی فەلسەفەو هزر، بەم شێوەیە دابڕان بریتییە لە پرۆسەی بە عەقڵانییەتکردنی هزرو فەلسەفەو ڕزگارکردنیانە لەپراکسیسی سادەو ساکاری ئایدیۆلۆژی ڕۆژانەیان‌و نمایشکردنەوەیان بەشێوەیەکی پتەوو تۆکمەو هەمەکییانە(١٧)، ئەوەش مەسەلەیەکی ئاڵۆزو سەخت بوو، بەلام هیگڵ ئەنجامی دا، بۆیە هزرڤانی ئەڵمانی تیۆدۆر هابرماس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هیگڵ یەکەم فەلسەفەکارە دابڕانی مۆدێرنیزم لەگەڵ سرووشی پێوەرە ڕابردووەکانی ڕابردووی نامۆ لەخۆی لەنێو چوارچێوەیەکی فەلسەفیدا بخاتەڕوو، فەلسەفەی زەمەنە نوێیەکان هەر لەسکۆلاریستەکانەوە تا دەگاتە کانت دەربڕی هەمان بیرۆکەن لەبارەی مۆدێرنیزم، ئەوەش لەمیانەی ڕەتکردنەوەو ڕەخنەگرتن لەکەلەپوورو ئاماژەکردن بۆ سەرهەڵدانی دابڕان لەنێوان سەردەمەکاندا بەرەچاوکردنی پرۆسەی چاکسازیی ئایینی‌و کۆمەڵایەتی‌و یاسایی، بەتایبەتیش لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرەتاکانی زانستی نوێدا، بەلام مۆدێرنیزم وەکو پرۆسەیەکی فەلسەفی قووڵ لەپێناو خودی نوێگەریدا، بەم شێوەیە بەربلاوە، تا سەردەمی هیگڵ نەخراوەتە ڕوو.

نویگەری لەسەردەستی ئەودا، ئەوەندە بە گۆڕوتینەوە هاتە نێو گۆڕەپانی هزر، بە شێوەیەك هیگڵ وەکو مەسەلەو بابەتێکی فەلسەفی دەیخاتە ڕوو، بگرە لەوەش تێپەڕ دەکاتو دەیکات بەمەسەلەی بنەڕەتی لەنێو فەلسەفەدا، چونکە چەمکی دیالیکتیکی مێژوویی ڕاستەوخۆ مانای نمایشکردنی پرۆسەی پێشڤەچوونو نوێگەرییە، بۆیە هیگڵ لەنێو زەمەنە نوێیەکاندا بەدوای پرنسیپی خودێتیی ئەم زەمەنەدا دەگەڕێت، ئەم پرنسیپەش وا دەکات خودی زەمەنی نوێ لەئاست زەمەنی ڕابردووی تێپەڕدا، جیاواز بێت.

بەپشت بەستن بەم پرنسیپە دێت بالاّ دەستیو سەرکەوتنی جیهانی تازە دیاری دەکات، لەهەمان کاتیشدا ئاماژە بەم هەموو پووچییە دەکات کە ئەم سەردەمە نوێیانە لەنێو خۆیاندا هەڵی دەگرنو دووچاری قەیرانو کێشەی مەزنی دەکەنەوە، لەبەرئەوەی ئەم جیهانە نوێیە بەدوو ڕوو خۆی نمایش دەکات، ڕووێکیان ئەوەیە بریتییە لەچەمکی پێشکەوتنو نوێبوونەوە، ڕووێکی تریشیان زەمەنی ئەو رۆحەیە کە خاوەنی خودێتی خۆی نییە، یەکەم هەوڵی هیگڵ بۆ مەزندەکردنی مۆدێرنیزم بۆ خۆی ڕەخنەگرتنە لە مۆدێرنیزم، ئەو تەنیا بەشانوباڵی نوێگەریدا هەڵنادات وەکو پرۆسەیەکی مێژوویی بەردەوام، بەڵکو گەرەکیەتی ئەو پرۆسە مێژووییە خاوەنی ناسنامەو خودی تایبەت بەخۆی بێت، تا بتوانێت خۆی لەزەمەنی ڕابردوو دابڕێنێتو لەسایەی چەمکی جیاوازیدا خۆی وەکو نوێگەری دەربخات، مەبەستمان لەچەمکی جیاوازی هەمان ماناو دەلالەتە کە جاك دریدا دایهێناوە، مەبەستی دریدا لەچەمکی جیاوازی، ئەو ڕووداوانەیە کە دەلالەت لەبوونی جیاوازی نێوان گوتارەکان دەکەن، جیاوازی نێوان گوتارەکان، خودی ئەو ڕووداوانەن کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی ئەم گوتارە جیاوازانە، ئێمە کاتێك تێبینی بوونی جیاوازی لەنێو گوتاری نوێدا دەکەین، ئەوەش تێبینی دەکەین ئەم جیاوازییە نوێیە ڕەگوڕیشەی قووڵی ڕابردووی هەیە، لەڕوانگەی چەمکی جیاوازیدا ئەوە بەدی دەکەین هیگڵ فەلسەفەکەی خۆی





بە شێوەیەکی وا دابەش دەکات تا ئاماژە بەو دابڕانە مەزنانە بکات کە لەنێو ئەم مێژووە فەلسەفییە دوورەدا بوونیان هەیە. ئەوەتا لەنێو کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای رۆح)دا هیگڵ ئەوەمان بۆ ڕاڤە دەکات کەچۆن هۆشیاری هێدی هێدی لەسایەی پرۆسەی بالاّ بووندا، لەشێوەی سەرەتاییانەی هەستەوە دەگاتە زانست، دواتریش دەگاتە لۆژیك، چونکە خۆی لەنێو خودی خۆیدا مەزندە دەکات، دواتریش فەلسەفەی سروشت ئاماژە بەو چرکەیە دەکات کە تێیدا رۆح وەکو نامۆ لەخودی خۆی، خۆی نمایش دەکات، دواتریش فەلسەفەی رۆحو تێیدا ئاماژە بەوە دەکات چۆن رۆح لەسایەی پەنا بردنەبەر یاساو ڕەوشتو ئایینو فەلسەفەوە دەگەڕێتەوە بۆسەر خودی خۆیو خۆی لەنێو ئەم دامو دەزگاو دامەزراوانەدا دەبینێتەوە. هیگڵ بۆخۆی کاتێك ئەم پرسە ڕاڤە دەکات پێیوایە ئەوە میتۆلۆژیایەکی فراوانی رۆحە، یا ئەزموونێکی مەزنی رۆحە(١٨). رۆح لەسایەی ئەم پرۆسەیەی پڕ لەدابڕاندا هەرجارەو بەشێوەیەکی نوێترو هۆشیارانە تر خۆی دەردەخات. ئەم پرۆسەیە بۆ مۆدێرنیزم لەلای هیگڵ دەچێتە نێو قووڵایی کردەی فەلسەفی، بۆیە لەوانەبێژییەکانیدا سەبارەت بەمێژووی فەلسەفە، فەلسەفەی کلاسیکی سەردەمە ڕابردووەکان هەر تەنیا بەلاوە نانێت، لەبەرئەوەی ئامانج و مەبەستیان مەعریفە نەبووە وەکو پرۆسەیەکی مەعریفی قووڵ بۆ خوێندنەوەی واقیعو ڕاڤەکردنی، بەڵکو پێیوایە هەوڵێك بووە بۆ گەیشتن بەئارامی رۆحو ئاسوودەییو دڵنیایی عەقڵ لەئاست گەردووندا- ئەتاراکسیا-بەڵکو ئەو دێت لەم وانەبێژییانەدا بێ توانایی هزری تێڕامانکاری دەردەخات لەوەی بتوانێت خودی هزر بکات بە بابەتی بنەڕەتی تێڕامانیو لێکدانەوەی هزری، لێرەدا ئەوەی هیگڵ ئاماژەی بۆ دەکات ئەوەیە کەوا فەلسەفەی تێڕامانکاری، دووچاری حاڵەتی سکۆلستیکی(١٩) بووەو ناتوانێت خۆی لەم بارە دەربازبکات، کاتێکیش عەقڵ دەچێتە نێو قاڵبی سکۆلیستیکییەتەوە، ئەوە سانا نییە بتوانێت لەم قاڵبە تێپەڕ بکاتو بێتەدەر، چونکە ئەم قاڵبە سکۆلستیکییە کۆنترۆڵی عەقڵ





دەکاتو بەم شێوە کۆنترۆڵکراوە واقیع نمایش دەکات، کاتێکیش عەقڵ کۆنترۆڵ دەکرێت، توانای دەستنیشانکردنی ئامرازو شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەزموونی گۆڕاوو تێبینیو تێڕامانی ڕاستەوخۆ لەدەست دەداتو ناتوانێت لەسایەی واقیعەوە ئەم پێوەندیو هاوکێشانە ڕاڤەبکات، بەشێوەیەك ناتوانێت لەگەڵ واقیعدا ڕەفتار بکات، تەنیا لەسەر ئاستی مەسەلەو هزری پێشتر داڕێژراودا نەبێت، ئەو هەڵەیەی سکۆلستیکییەکانیش تێی دەکەونو ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، ئەوەیە کە ئەوان بەبێ گەڕانەوە بۆ واقیع ڕاڤەکردنی کردەی هزری دەکەن بەکردەیەك بۆ هەڵهێنجانی هزر لەهزر، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی هزر لەنێو خۆیدا بەدەوری خۆیدا بخوولێتەوە، چونکە ئەوکاتە دەکرێت هەندێك مەسەلەی لۆژیکی ڕاست بێنەبوون لەلایەنی تیۆرییەوە، کەچی لەلایەنی پراکتیکییەوە لەگەڵ واقیعدا ناتەباو نەگونجاو دەبنو شکست دێنن، بۆیە فەلسەفەی تێڕامانکاری لای هیگڵ دووچاری گێژەنی سکۆلستیکییەت بووەو ناتوانێت دەست بەواقیعەوە بگرێت(٢٠).

ئەنجام هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شێوەی تایبەتی فەلسەفە هاوشانی شێوەیەکی تایبەتی گەلێکە کە لەنێوانیاندا سەرهەڵدەدات، پەیوەستە بەسیستەمی تایبەتی دەوڵەتەکەی ئەوانو شێوەی حکوومەتو ڕەوشتو ژیانی کۆمەڵایەتیو تواناو دابونەریتو شێوازەکانی حەسانەوە لەژیانیداو هیواو کارەکانیان لەبواری هونەرو زانستو ئایینو چارەنووسی سەربازییانو پێوەندییە دەرەکییەکانیان بەدارمانی ئەو حاڵەتانەی کە تێیدا ئەم پرنسیپە تایبەتییە هێزی خۆی پێ دەرخستووە بەسەرهەڵدانی چالاکیو حاڵەتی نوێ کە تێیدا لەدایك دەبێتو لەسەر بنەمای بالاتر پێشڤەدەچێت(٢١).

هیگڵ لەکتێبی (ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان)دا، ڕێبازی ئایدیالیزمی خۆی بەشێوەی دیالیکتیکی دەخاتە ڕوو، جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە کەسەرجەم دیاردە سروشتیو کۆمەڵایەتییەکان لەسەر





بنەمای ڕەها واتا ڕۆح-عەقڵ-هزر-یا عەقڵی گەردوونی- ڕۆحی جیهان، یا هەر زاراوەو ناوێکی تر کە هیگڵ لەنێو نووسینە فەلسەفییەکانیدا بەکاریان دەهێنێتو ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هزری ڕەها بەسێ قۆناغدا تێپەڕ دەبێت، یەکەمیان ئەوەیە ڕۆح بۆ خۆی لەخودی خۆیدا بەرەو پێش دەچێت، واتا مەبەستی لۆژیکزانییە، چونکە هزر ناوەڕۆکی خۆی لەسایەی نەسەقی گوتەی پەیوەست بەیەکتریەوە دەردەبڕێت. دووەمیان پێشڤەچوونی هزرە لەوێنەی بوونی ئەویتردا یا لەوێنەی سروشتدا، مەبەست لەوەش فەلسەفەی سروشتە، هیگڵ لەو باوەڕەدایە سروشت پێشڤە ناچێت، بەڵکو بۆخۆی ڕوخساری دەرەکی پێشڤەچوونی خودی گوتە لۆژیکییەکانە کە جەوهەری ڕۆح پێکدەهێنن.

سێیەمیان پێشڤەچوونی هزرە لەنێو هزرو مێژوودا، ئەوەش واتا فەلسەفەی ڕۆح، لەم قۆناغەشدا، هزری ڕەها بەرەو ناوەوەی خۆی دەکشێتەوەو ناوەڕۆکی خۆی لەسایەی شێوە جیاوازەکانی بەڵگەخوازەیو چالاکی مرۆڤایەتی مەزندە دەکات. لەسایەی ئەم پرۆسە دیالیکتیکییەی پێشڤەچوونی ڕۆحەوە هیگڵ پێیوا بوو گەیشتووەتە لووتکەی پێشڤەچوونی خودی هزری ڕەهاو لەهەمان کاتیشدا هزری ڕەها گەیشتووەتە ئیدراکی خودی خۆی(٢٢).

نوێگەری فەلسەفی بەمانا هیگڵ-ییەکەی، نوێگەرییەکە، پەیوەستە بەسەرجەم لایەنە ژیارییەکانی نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتیو ڕاستەوخۆ بەسەرهەڵدانی چالاکی نوێ پەیوەستە، کەواتە هیگڵ باس لەهاوشانی فەلسەفەیەکی دیاریکراو دەکات لەگەڵ هەندێك تایبەتمەندی دیاریکراوی سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراودا، واتە ئەم تایبەتمەندییە دیاریکراوانەن کەوا دەکەن سەردەمێکی مێژوویی لە سەردەمێکی تر جیا بکرێتەوە. لەهەمان کاتیشدا خودی ئەم تایبەتمەندییانەن کەچەمکی مۆدێرنیزمو گۆڕان دەسەپێنین، چەمكو مانای زاراوەی سەیروورت لەلای هیگڵ مانای بەیەکەوە پەیوەستبوونو کۆبوونەوەی دژەکان ناگەیەنێت لەنێو یەك

پرۆسـەدا، بەڵکو مانای گواستنەوەو بازدان دەگەیەنێت لەدژێکەوە بۆ دژێکی تـر، چـونکە ناکرێـت دوو دژ لەنـێو پرسـی سـەیروورەتی پێشڤەچـووندا کۆببنەوەو یەك بگرن.

ئـەوەی لـێرەدا لـەم بۆچوونەی هـیگڵ‌دا جێگای بایەخ‌و تێڕامانە، ئەوەیە ئـەو بـاس لەهاوشـانی فەلسـەفە دەکـات لەگـەڵ لایەنـە ژیاریـیەکانی تـردا، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئاگـاداری ئـەوە بـووە کـە سانا نییە ئێمە بتوانین لەسایەی فەلسـەفەیەکی دیاریکـراوەوە لەسـەرجەم ئـەم سـەردەمە مێژوویـیە بگـەین، وێـڕای ئـەوەی ئـەو بـڕوای وایـە، مادامـەکی فەلسـەفە لـەناوەڕۆکدا بۆخـۆی جەوهەری سەیروورەتی مێژووە، بۆیە سانا نییە لەنێو کۆمەڵگای مەدەنیدا، بــەم چــەمکەی هــیگڵ باســی لــێوەدەکات بوونــی هەبێــت لەوحاڵەتــە تێڕامانکارییە تێـپەڕ بکات کـە ڕەخـنەی ئاراسـتە کـردبوو، بتوانێت وەکـو کـردەیەکی مەعریفی بێتە مەیدان‌و لەبواری پراکسیسدا خۆی نمایش بکات، بۆیــە ئــەو دەگاتــە ئــەو بــاوەڕەی ڕۆحــی ڕەهــا، ســانا نیــیە لەنــێو ئــەم کۆمەڵگایانــەدا بتوانێـت خـاوەنی خودێتـیی خـۆی‌و نـامۆ دەردەکەوێـت، لەبەرئـەوەی چالاکییە داهێنەرەکانی ئـەو ڕۆحـە ڕەهایـە بریتییە لەهزری تـێڕامانکاری‌و بـەم شـێوەیەش خـۆی دەردەخـات، ئـەم هاوشـانی بوونـەی فەلسەفە لەلای تیۆدۆر ئۆیزرمان جۆرە پەڕەلێل بوونێکی مێژوویەو هیگڵ لـەم بنچینەیەدا لەنـێو ڕۆحی گەلاندا، بەدوای ڕۆحی زەمەندا دەگەڕێت، تا لەکۆتاییدا لەنـێو خـودی ڕۆحـی ڕەهـادا بـەدی دەکات، لـێرەدا ڕۆحـی ڕەها، بەبالاتـرین شـێوە خـۆی نمـایش دەکـات، ئـەویش فەلسـەفەیە، لەبەرئـەوەی پێشڤەچوونی فەلسەفە کردەیەکە هاوشانی ئیدراکی خودی ڕۆحی ڕەهایە.

کەواتــە هــیگڵ لــێرەدا فەلســەفە وەکــو حاڵەتــێکی تێــپەڕ بۆســەردەمی مـێژوویی دیـاری دەکـات، بەشـێوەیەك ئـەم سەردەمە سەردەمێکی دیاریکراو دەبێـت لـەنامۆ بوونـی ڕۆحـی ڕەهـادا، ڕۆحـی ڕەهاش ناتوانێت خودی خۆی لەنـێو فەلسـەفەدا بـەدی بکات، تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە دەتوانێت لەسایەی ئامادەبوونی خودی خۆیەوە، ئەم نامۆبوونە تێکبشکێنێت.





بـەم شـیوەیە لێکۆڵیـنەوەکانی هـیگڵ جەخـت لەسـەر ئـەوە دەکەنـەوە کە فەلسـەفە لـە ڕێگـای پێشـکەوتندایە بـەرەو بونیادنانـێکی نوێی کۆمەڵایەتی، واتـا فەلسـەفە بونـیادی کۆمەڵایەتی نوێ دادەهێنێت‌و ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆش لەپێشڤەچوونیدا دەبینێت.

## هونەر لەنێو پرسی مۆدێرنیزمدا

بەپـێی تێڕوانیـنی ئێسـتاتیکییانەی هونـەری‌و هـەموو کـارو بەرهەمـێکی هونـەری، لەسـەر دوو ئاسـت‌و دوولایـەن خـۆی نمـایش دەکـات‌و دەردەخـات، یەکەمـــیان: ئاســـتی ڕۆحیـــیە، دووەمـــیان: ئاســـتی فـــۆرم‌و شـــێوەی بەرجەسـتەکراوی ماددیـیە، ئیسـتاتیکای جوانـی لەنـێو کـاری هونـەریدا، بریتیـیە لـەو درەوشـانەوەیەی هەسـتەکان وەری دەگـرن لـەکاتی تـێڕامان‌و بیـنین‌و بیسـتنی کـارێکی هونـەریدا، ئـەم درەوشـانەوە هەستییە، لەناوەوەی ڕۆحـدا جـێگیر دەبێـت‌و بەشـی جەوهـەری کـاری هونەریـیە، بەشـێوەیەك ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ، کـار لـەناخی نـاوەوەو قوڵایـی ڕۆحـی مـرۆڤ دەکـات، بەشـێوەیەکی تر، لەلایەنی جەوهەری کاری هونەری، پێویستە وەکو سـێنتەرێکی مـیحوەری لەنێو سەرجەم ئاستەکانی کاری هونەریدا کاربکات‌و بـیانخاتە ڕوو، چـونکە سـەرجەم لایەنـە هونەریـیەکانی کـاری هونـەری بەیەکـەوە دەربـڕی ماددەی هونـەرین‌و ناکرێـت لەناخـەوە لەیـەکتری جـیا بکرێـنەوەو دابـڕێندرێن، بۆیـە هەمـەکی کـاری هونـەری وەکـو یەکێتییەکی ئۆرگانی دەردەکەوێت، تێیدا یەکێتی کارەکە دەبێتە ڕۆح‌و بەرجەستەبوونی شـێوەی مـاددیش دەبێـتە جەسـتەی کـاری هونـەری، ئـەوەش لـەلای هـیگڵ پێداویسـتی بەرجەسـتەبوونی بیرۆکـەی هونەریـیە لەنـێوەندو سـێنتەری هەسـتیدا. ئـەم دوو لایەنـە هاوشـانە-نـاوەڕۆك‌و فـۆرم-لەنـێو کـاری هونـەری بـەرزدا وەکـو دووهـێڵی هاوتەریـب بـەڕێگادا دەڕۆن‌و یـەکتر دەگـرن، بـەبێ





ئـەوەی یـەکتری بـبڕن، بەشـێوەیەك بەرجەسـتە بوونـی فـۆرم دەربڕی تەواو هەمەکیـیانەی نـاوەڕۆکی کـاری هونـەرییە، لەم لاشەوە ناوەڕۆکی رۆحی لەم بەرجەسـتـە بوونـەدا خـودی خـۆی دەدۆزێـتەوەو دەگاتـە ئـەو ئاسـتـەی بەشێوەیەکی ڕەها خۆی دەربخات.

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم هاوشـانیو هاوتەریبیـیە بـەردەوام لەنـێو کـاری هونــەریدا دەرناکەوێــت یــا بــەم شــێوە پــتەوو تۆکمەیــە نابێــت کــە چاوەڕوانکراوە، بۆیـە پێوەندیـیە جـیاوازەکانی نـێوان نـاوەڕۆكو فـۆرم وا دەکـات هیگڵ بگاتە ئەو باوەڕەی هونەر بەردەوام دابەش دەبێتە سەر چەند جۆرێکی سەرەکیو بنەڕەتی بەم شێوەیەی خوارەوە:

١) ئـەوکارە هونەرییـەی مـاددەو فۆرمـی بەرجەسـتەکراو تێـیدا بەسـەر نـاوەڕۆکی رۆحـیو جەوهـەری نـاوەوەیدا زاڵە، لێرەدا ناوەڕۆکی رۆحی کاری هونـەری لەهـەوڵو کۆششـی ئەوەدایـە بتوانێـت بـە شـێوەیەکی ڕەوان خـۆی دەربخـاتو بخاتـە ڕوو، بـەڵام لـەم هـەوڵو کۆششـەیدا سـەرکەوتوو نابێـت، چـونکە ناتوانێـت کۆنـترۆڵـی نـێوەندی مـاددی بەرجەسـتـەکراو بکـات، لەبەرئـەوەی لایـەنی مـاددی بەسەر لایەنی رۆحیو ناوەڕۆکدا زاڵە، نموونەی ئەوەش لەلای هیگڵ بریتییە لەهونەری ڕەمزی.

٢) ئـەو کـارە هونەرییـەی دەتوانێت جۆرە هاوسەنگیو تەباییەك لەنێوان هـەردوو لایـەنو ئاسـتی-ماددیو رۆحی-یەوە دابین بکات، ئەوە بەشێوەیەکی گونجاوتــر دەتوانێــت خــۆی دەربخــات، چــونکە نــاوەڕۆكو فۆرمــی بەرجەسـتەکراو هاوشـانی یـەکترینو لەسـایەی یەکتریـیەوە خۆیـان نمـایش دەکەن، نموونەی ئەوەش لەلای هیگڵ بریتییە لەهونەری کلاسیکی.

٣-ئـەو کـارە هونەرییـەی تێیدا بـە پێچـەوانەی هـەردوو حاڵەتی سەرەوە، رۆح تێـیدا بـالاْ دەستەو کۆنـترۆڵی ماددەی بەرجەستەکراو دەکات، لەم جۆرە هونـەرەدا مـاددەی بەرجەسـتەکراو دەبێـتە پاشـکۆو پەراوێـزی جەوهـەری رۆحـی کـاری هونـەری، نموونـەی ئـەم جۆرە هونەرەش لەلای هیگڵ هونەری ڕۆمانتیکییە.





ئـەم سـێ ئاسـتو شـێوازەی دەربڕیـنی کـاری هونـەری لەسـەر سێ قۆناغی هونــەری یــەك لەدوایــەکدا خۆیــان دەردەخــەن، لەگــەڵ ئەوەشــدا ئــەم خــۆ دەرخسـتنە یـەك لەدوای یەكو پێشەچوونە نوێگەرییانەی بەسەر بابەتو مـاددەی هونەریدا دێت لەلای هیگڵ-ەوە لەبنەڕەتدا پێشەچوونێکی عەقڵی، یـا پێشـەچـوونێکی لۆژیکـیو قەبوڵکـراوە، مادامــەکی ئـەم پێشـەچـوونە لۆژیکیـیە، ئـەوە دیـارە هـیچ پێوەندیـیەکی بـە زەمانـەوە نییە، چونکە لەنێو خـودی خۆیـدا بـریتییە لەپرۆسـەی پێشەچوونو بـەردەوامی مۆدێرنـیزم، لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیگڵ بڕوای بەوە هەیە ئەم پێشەچوونە کردارەکییانەی هونـەر لەنـێو مێژووی جیهاندا تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بەپێشەچوونی هـزری سـەرجەم مـرۆڤایەتی، چـونکە هونەری کۆن هونەرێکی ڕەمزی بووە، کەچـی هونــەری دواتــر لەســەدە ناوەندیــیەکانو ســەردەمی گــریکی بــەر لەسـەرهەڵدانی سـاڵی زاییـنی هونـەرێکی کلاسیکی بووە، بەڵام هونەری نوێ لەسـەردەمی ئـەودا هونـەرێکی ڕۆمانتیکی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە ئـەم پۆلێـنکردنە هونەرییە بۆ مێژوی هونەر سەد دەرسەد بەسەر سەرجەم مـێژووەکاندا ڕاسـتو دروسـت بێـت، چـونکە دەبێـت ڕەچاوی ئەوەش بکەین کـە سـەرجەم حاڵـەتو ئاسـتە هونەرییـەکان، لەنێو سەرجەم سەردەمەکاندا بونـیان هـەبووەو بەردەوامـیش بوونـیان هەیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەم ئاستە هونەرییـە جیاجیایانە پەیوەستی گەلو شارستانییەتو ناوچەی ژیاری جیا جـیا بوونـە، لەبەرئـەوەی هونـەری گـەلانی خۆرهـەڵاتی کـۆن بەتایبەتـیش هونـەری میسـریو هیـندی کـۆن، هونـەرێك بـووە پـڕ لەڕەمزییـەت، کەچـی هونـەری گـریکی کـۆن هونـەرێکی کلاسیکی بـووە، لەولاشەوە هونەری نوێی ئـەوروپای سـەردەمی هـیگڵ هونەرێکـە ڕێـبازی ڕۆمانتـیکی بـاڵی بەسـەردا کێشاوە.

# هونەری ڕەمزی

هونەری ڕەمزی هونەرێکە پەیوەستی مێژووی ڕابردووی دووری هزری مرۆڤایەتییەو قۆناغی یەکەمی سەرهەڵدانی هونەرە لەنێو مێژووی مرۆڤایەتیدا، ئەشکەوتە کۆنەکانی مرۆڤی کۆن شایەدو بەڵگەن لەسەر ئاستی بەرزی ئەم هونەرەو ڕۆڵی لەداهێنانی پێشکەوتنی هونەری لەنێو هزری مرۆڤدا، مرۆڤ لەسایەی پرۆسەی هونەرییەوە گەرەکییەتی هزرو بۆچوون‌و تێڕوانینەکانی خۆی بۆ گەردوون‌و جیهان‌و مرۆڤایەتی‌و سروشت دەرببڕێت، بەتایبەتیش بەرجەستەکردنی لایەنی ڕۆحی خودی خۆی لەسایەی کارێکی هونەرییەوە، بەڵام کاتێك مرۆڤی کۆن لەنێو شارستانییەتە مەزنەکانی خۆرهەڵات نەیتوانیوە ئەم لایەنە ڕۆحییەی خۆی دەرببڕێت، ئەوە پەنای بردۆتە بەر هونەری ڕەمزی‌و وەکو یەکەم هەوڵ‌و کۆششی هزری هونەری خۆی ئەم هونەرەی داهێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ پێی وایە مرۆڤ سەرکەوتوو نەبووە لەبەرجەستەکردنی هزرە ڕۆحییەکانی خۆی لەنێو ئەم شێوازە هونەرییەدا(٢٣).

چییەتی ڕەمز ئەوەیە کەوا ئاماژە بەمانایەکی دیاریکراو دەکات، بەڵام بەڕوون‌و ئاشکرایی ئەم مانایە دەرنابڕێت‌و ناخاتە ڕوو، بەڵکو ئەم مانایە لەنێو شێوەیەکدا بەرجەستە دەکات، جا گرنگ نییە لەلایەنی شێوەیی‌و وەسفییەوە شتی بەڕەمزکراو هاوشێوەو هاوخاسیەت‌و سیفاتی شتی ڕەمز بۆ کرابێت، بۆ نموونە لەنێو هونەری ڕەمزیدا وا باوە کەوا شێر ڕەمزو نیشانەی هێزە، بۆیە ڕەمز بریتییە لەبەرجەستەکردنێکی ماددی لەبەر چاوماندا، بەڵام ئەوەی ئاماژەی بۆ دەکات ئەوە هزرو مانایەکی ڕۆحییە، بەم شێوەیە ڕەمز لەنێو هونەری ڕەمزیدا ڕۆڵی بەرجەستەکردنی ماددی دەگێڕێت‌و مانایەکەشی بریتییە لەناوەڕۆکی بابەتەکە، بەڵام بۆ ئەوەی







ڕەمز بەڕاستی بتوانێت ببێت بەڕەمز ئەوە پێویستە جۆرە پێوەندییەکی ڕۆحی لەگەڵ مانایەکەیدا هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لەگەڵ هەمان مانای خۆیدا زۆر جیاواز بێت، ئەگینا ئەوە نابێتە ڕەمز، بەڵکو دەبێتە وێنەی ماناکە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام کۆمەڵێك ماناو دەلالەت‌و دەربڕین لەخۆیەوە بگرێت‌و ئاڵۆز خۆی دەربخات‌و نمایش بکات، چونکە ڕەمزێکی دیاریکراو دەکرێت جگە لەو مانا دیاریکراوەی بەرجەستەی دەکات‌و خەڵك لەسەری کۆکن مانای زۆرو زیاتریش ببەخشێت(٢٤)، ئەم فرەمانایی‌و دەلالەتە ئەوەمان بۆ ڕاڤە دەکات کە مرۆڤی کۆن بۆچی بەردەوام هەستی بەهێزێکی مەزن‌و نهێنییەکی گەورە کردووە لەهونەری ڕمزیدا، ئەم شێوە نمایشکردنەی ڕەمز هیگڵ-ی بەم ڕووگەیەدا برد بگاتە ئەو باوەڕەی ئەم جۆرە تێڕامان‌و بیرکردنەوەیەو فرە مانایەی ڕەمزێك ڕاستەوخۆ لەگەڵ هزرو عەقڵی مرۆڤی سەردەمی کۆن دەگونجێت کە هێشتا نەیتوانیبوو کێشە ڕۆحییەکان چارەسەر بکات‌و هێزە میتافیزیکییەکان‌و کۆسمۆپۆلیتیکی نەدەناسی، بۆیە جیهان وەکو مەتەڵێك دەهاتە بەرچاو، بەڵام لەبەرئەوەی کاری هونەری وەکو سەرەتا ئاماژەمان بۆ کرد دوولایەن‌و دوو ئاستە، ناوەڕۆك‌و بەرجەستەکراوی ڕەها، ئەوە هیگڵ دێت شێوازی هونەری ڕەمزی کۆن لەنێو شارستانییەتە کۆنەکان ڕاڤە دەکات‌و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ لەنێو سەرجەم قۆناغە هونەرییەکانی خۆیدا دەرکی بەوەکردووە کە هونەر لەسەر دوو ئاست‌و لایەنەوە خۆی دەردەخات، ئەگەرچی ئەم دوو لایەنە جیاوازیشن، یەکەم کاری هونەریش ئەوەیە بتوانێت هەردوو لایەن‌و ئاست لەنێو یەکێتییەکی هەمەکیدا کۆبکاتەوە، ئەم پێداویستییەی کۆکردنەوەیان سەرەتا پێویست بەوە دەکات جیاببنەوەو دابڕێن، بۆیە دەبینین هیگڵ پێ لەسەرئەوە دادەگرێت هەندێك گەل‌و شارستانییەتی کۆن هەبوون جیاکاری‌و دابڕانی نێوان ئەم دوو ئاستەیان نەزانیوەو ڕەچاویان نەکردووە، یەکێك لەم گەلانەش گەلی ئێرانی کۆنە کە هیگڵ بەناوی زەند(٢٥) ناو زەدیان دەکات.





ئەو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گەلی فارسی کۆن ڕۆشناییان بۆیە دەپەرست گوایە خواوەندە، کەواتە ئەوان ڕۆشناییان وەکو ڕەمزێك بۆ خواوەند بەکارهێناوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە واسەیری ڕۆشناییان کردووە کەوا خودی خواوەندی بەرجەستەکراوە، ئەوان پێیان وابووە ئەم جەوهەرە مادییە کە بریتییە لەڕۆشنایی خواوەند، بەڵام ڕۆشنایی لەلای هیگڵ دیاردەیەکی مادییەو پێوەندی بەخواوەندەوە نییە، بۆیە دەگاتە ئەو باوەڕەی کە گەلی ئێرانی کۆن نەیانتوانیوە جیاکاری بخەنە نێوان لایەنی ڕەهای رۆحیو لایەنی بەرجەستەکراوی ماددی، بەم شێوەیە دەگاتە بڕیاری ئەوەی گەلی ئێرانی کۆن خاوەنی هونەر نین، چونکە لە تایبەتمەندێتیو سیفاتی کاری هونەری نازانن(٢٦).

ئەم دابڕانو جیاکارییەی نێوان ڕەهاو بەرجەستەکراو، ئەم دابڕانە پێویستەی کاری هونەری دەکرێت بە هۆشیارییەوە بێتو لەهەمان کاتیشدا دەکرێت لەناهۆشیارییەوەش بێت، ڕەنگە مرۆڤ هەست بەپێویستی بوونی ئەم جیاکارییە بکات، بەڵام لەسەر ئاستی دەربڕیندا نازانێت چۆن بانگەشەی بۆ بکات، کەواتە هەر پرۆسەیەکی هونەری نوێ سەرەتا لەناوەوەی مرۆڤ لەسایەی هەستێکی ناوشیارانەوە سەرهەڵدەدات، تا دواتر دەتوانێت دەری ببڕێت، بۆیە هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هونەری ڕەمزی لەلای هیندییەکان هونەرێکە لەجۆری یەکەم، واتا هیندییەکان هەست بەوە دەکەن پێویستە ئەم دوو لایەنە جیاوازبن، بەڵام بەتەواوی وشیارییەوە نییە، کەچی هونەری ڕەمزی لەلای میسرییەکان بە شێوەیەکی کامڵو تەواتر وەکو ڕەمز خۆی نمایش دەکات.

هیندییەکان هەستیان بەوە کردووە دەبێت لەنێو کاری هونەریدا جیاوازی بکرێت لەنێوان ناوەرۆکی ڕەهاو ماددەی بەرجەستەکراودا، بەڵام ئەم دوولایەنە بەتەواوی دانەبڕاون، بۆیە لەهەندێك کاتو شوێندا بەدابڕاوی بەدییان دەکەینو لەهەندێك کاتو شوێنی تریشدا بەیەکگرتوویی، ئەم بالادەستییەی لایەنێك بەسەر لایەنێکی تردا ئەم







ئاوێتەیەی نێوان خواییو هەستی بەرەو ئەو خەیاڵە پڕ لەدڵەڕاوکێیەیانی ئاراستەکردووە، ئەوەش بۆتە یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی هونەری هیندی، ئەم دڵەڕاوکێو بێزارییە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەم گەلەی ئەو هونەرەی بەرهەمهێناوە بەلایەنی کەم گەر لەناهوشیارییەوەش بێت ئەوە هەست بەئەو دژکارییانە دەکات لەنێو مەزندە هزرییە مەزنەکانی خۆیدا.

هیگڵ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت هونەری میسری کۆن لەنێو سەرجەم شارستانییەتە کۆنەکاندا بالاترین ئاستی هونەری ڕەمزییەو بەتەواوی دەربڕی ڕەمزییەتە وەك ڕێبازێکی کاری هونەری، چونکە میسرییەکان بەتەواوی هەستیان بەوە کردووە کە دەبێت لەنێوان لایەنی خودایی ڕەهاو بەرجەستەکردنی مادییەوە جیاوازیو دابڕان هەبێت بۆیە ڕەمزییەتی ئەوان ڕەمزییەتێکی ڕەسەنترە(٢٧).

دوای ئەوەی هیگڵ بەوردی قسە لەسەر شێوازە هونەرییە ڕەمزییەکانی شارستانییەتەکان دەکات، دەگاتە ئەو باوەڕەی هونەری ڕەمزی ئەوکاتە بەرەو هەڵوەشاندنەوەو لەبارچوون دێت کەوا هەردوو لایەنو ئاستی رۆحی ڕەهاو بەرجەستەکراوی ماددی بەیەکجار لەیەکتر دادەبڕێن بەشێوەیەك پێوەندییان کزو لاواز دەبێتو ناتوانن یەکتری تەواو بکەنو دەربڕی مانای یەکتری بن، ئەوکاتەش هونەری ڕەمزی بەرەو کزبوونو لەناوچوون دەڕوات، ئەم لەناوچونەی ڕەمزییەتە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شێوازێکی هونەری نوێتر ئەویش هونەری کلاسیکییە.

# هونەری کلاسیکی

ئێمە لەگەڵ هیگڵ ئەوەمان زانی کە ئەو پێی وایە مەبەست لەکاری هونەری درك كردنی ڕەهایە، ڕەهاش بۆخۆی ماناو دەلالەتی رۆحە، لێرەدا رۆح لەسایەی هونەرەوە درك بەخودی خۆی دەکات، بەڵام رۆح بۆخۆی شتێکی عەینییە، بۆیە وشیاری ڕووت نابێتە رۆحێکی ڕاستەقینە، چونکە رۆحی ڕاستەقینە بریتییە لە وشیاری خودی، ئەو کاتەی رۆح لەنێو کاری هونەریدا بابەتێك بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت ئەوە لەم حاڵەتەدا رۆح خودی خۆی دەکات بەبابەتی خۆی، ئەم دابەشکردنە دوو لایەنیو دوالیزمییە دوو ئاستییە کۆنە بەلاوە دەنێت-ناوەرۆكو بابەت-لەم جیاکارییە تێدەگات، ئەو کاتەش یەکێتی عەینی رۆح خودی خۆی دەناسێت، بەدەربڕینێکی تر رۆح دەبێتە شتێکی هەمەکی، بەڵام شتێکی هەمەکی ئەپستراکت کراونا، لەبەرئەوەی هەمەکییە ئەوە هەر دەبێت دابەش ببێتە سەر پاژەکیو جوزئی، دواتریش هەمەکێتیو پاژەکی خۆی لەنێو تاکێتیی عەینیدا درك پێدەکات، بۆیە ئەگەر لەسەر هونەر پێویستە وا لە رۆحی ئادەمیزادی بکات درك بە سروشتی جەوهەری رۆح بکات، ئەوەش کارو فرمانی هونەرە، ئەوە مەسەلەیەکە مومکین نییە تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە رۆح وەکو شتێکی عەیینی بەرچاو مەزندەو وێنابکرێت، کەچی وەك بینیمان لەنێو هونەری ڕەمزیدا رۆح دەکەوێتە نێو ناوەرۆكو وەکو شتێکی ئەپستراکت سەیر دەکرا.

دوای ئەم ڕاڤەکردنو لێکدانەوە لۆژیکیو ئایدیالییە، هیگڵ دەگاتە ئەو بڕوایەی شکستی هونەری ڕەمزی لەبەیەکەوە گرێدانو لکاندنی ناوەرۆکی ڕەهاو بەرجەستەکراوی وێنەیی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هونەری ڕەمزی





هونەرێکە ناوەرۆك ئەپستراکت دەکات، گەر هونەر گەرەکی بێت بگاتە بالاترینو ئایدیاترین ئاست یا بگاتە ئاستی هاوسەنگیو هاوتەبایی تەواو لەنێوان وێنەو ناوەرۆکدا ئەوە دەبێت ناوەرۆك لە ئاستی شتێکی دیاریکراوی عەینییەوە نەبێت، تا هونەر بگاتە ئەو ئاستە پێویستە ئەو گەلەی بەرهەمی دێنێت واز لەم تێڕوانینە بهێنێت گوایە ڕەها بریتییە لە ئەبستراکت بوونێکی تەواوو ئەوە درك بکات کە چۆن دەتوانێت ڕەها بەشێوەیەکی عەینیی بەرچاو درك پێبکات، ئەوەبوو هیگڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەلای یۆنانییە کۆنەکاندا خوداوەند تەنیا شتێکی بەرجەستەکراوی ئەپستراکت کراوی بەتاڵ نەبووە، بگرە خاوەنی رۆحی تاکێتی خۆی بووە، لەڕاستیشدا کاتێك بەنێو جێماوە کۆنەکانی گریکدا دەچینەوە بەتایبەتیش بەنێو میتۆلۆژیاکانیاندا دەگەینە ئەوەی خوداوەندی گریکی مرۆڤێکی ئاسایی بووە، یا دەکرێت بڵێین لە شێوەی مرۆڤێکی ئاساییدا بووە، چونکە گریکەکان کەوتبوونە ژێر باری نەزعەی ئەنترۆپۆمۆرفیزمی. خودی نەزعەی ئەنترۆپۆمۆرفیزمی بریتییە لەوێناکردنو مەزندەکردنی خوداوەند بەشێوەیەکی ئادەمیزادانە، یا ئەو نەزعەیەیە کە سیفاتی ئادەمیزادانە دەخاتە پاڵ خوداوەند، ئەم نەزعەیەش لەنێو کولتووری گریکی کۆندا بالا دەست بووە، بۆیە لەنێو میتۆلۆژیاکاندا دەبینین خوداوەندەکان دەخۆنو دەخۆنەوەو خۆشەویستی دەکەنو ڕکابەرایەتیو دژایەتی یەکتریش دەکەن، بگرە لەوەش زیاتر فێڵ لەیەکتری دەکەنو جەنگ بەسەر یەکتریدا ڕادەگەیەنن، وەك چۆن ئادەمیزاد کاری وا دەکەن، بەڵام ئەوەی لێرەدا خوداوەندەکانی گریك لەمرۆڤی ئاسایی جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوان خاوەنی رۆحێکی نەمرو تواناکاری لەڕادەبەدەرن بۆ ئەنجامدانی کاری مەزنو کۆنترۆڵکردنی لایەنە ژیارییەکان، بۆیە ڕەهایان لەنێو پۆشاکی مرۆڤدا بەدی کرد، بەم جۆرە دەبینین نەزعەی ئەنترۆپۆمۆرفیزم سیمای دیارو بەرچاوی نێو هونەری کلاسیکییە.





کاتێك ناوەڕۆكی رۆحی لەنێو قاڵبی ئەپستراكتی بێ شێوەییدا دەرچوو بوو بەتاكێكی خاوەن شێوەیەكی دیاریكراو، ئەوە ڕاستەوخۆ پەیوەستی بەرجەستەبوونی ماددییانەی هەستەكان دەبێت، ئالێرەوە بیرۆكەی تۆتالیتارییانەی جەوهەری نێو هونەری كلاسیكی سەری هەڵداو بانگەشەی ئەوەی دەكرد گوایە ڕێكەوتن‌و هاوشانی‌و گونجانێكی تەواو لەنێوان ناوەرۆك‌و وێنەدا هەیە، چونكە ناوەرۆك بابەتێكی دەرەكی دەرەوەی وێنە نییە وەك ئەوەی لە هونەری ڕەمزیدا هەیە، بەڵكو ناوەرۆك لێرەدا لەنێو قووڵایی وێنەدایەو رۆحی وێنەكە پێكدەهێنێت، بۆیە شێوەی دەرەكی دەربڕی تەواوی ناوەڕۆكی ناوەكییەو هیچ شتێك لەنێو ناوەڕۆكدا نییە لەنێو وێنەی بەرجەستەكراودا دەرنەبڕدرا بێت، مادامەكی جەوهەریترین‌و ئایدیاترین كاری هونەری بریتییە لەوەی بەرجەستەی بیرۆكەیەك بكات لەنێو وێنەیەكی هەستی دیاریكراودا، ئەوە دیارە هیگڵ دەگاتە ئەو باوەڕەی كەوا هونەری كلاسیكی گەیشتۆتە لووتكەی تەواوبوون‌و باڵابوون(٢٨).

لەگەڵ ئەوەشدا هیگڵ دەگاتە ئەو ئەنجامەی هونەری كلاسیكی گریكیش دووچاری دارمان‌و هەڵوەشاندنەوە هاتووە، ئەوەی ئەم هونەرەی دووچاری هەڵوەشاندنەوە كردووە ئەوەیە شارستانییەتەكانی دواتر گەیشتنە ئەو باوەڕەی گریكەكان بەهەڵەو بەسەقەتی مەزندەی لایەنی خواوەندێتییان كردووە، بگرە لەوەش زیاتر هەڵەیەكی گەورەشیان كردووە، چونكە خوداوەند دەبێت رۆحێكی ئازادو بێ كۆتا بێت، كەچی خوداوەندەكانی گریك نەئازادو نەبێ كۆتا بوون،  لەپاڵ ئەوەی زۆریش بوون، هەر یەكێك بەربەست بوو لەبەردەم كارەكانی یەكێكی ترداو دەستی تێوەردەدا، ئەوان خاوەنی دەسەڵاتێكی مەزن نەبوون تا بتوانن جیهان ئاراستەبكەن، بۆیە زۆرجار خواوەندەكانی گریك نەیانتوانیوە چارەنووسی خۆشیان ئاراستە بكەن، لەبەرئەوەی لە ئاست قەدەردا چۆكیان دەداو ملیان كەچ دەكرد، بۆیە تەنیا بوونەوەرێكی نائاسایی بوون، خودێك بوون وەكو مرۆڤ ملكەچی سەیرووروەتی ڕووداوەكان بوون.





# هونەری ڕۆمانتیكی

ئەوكاتەی لەوە دڵنیا دەبین كە لایەنی خوداوەندی لە نێو هونەری كلاسیكیدا دیاریكراوو نائازادە، ئەوە دیارە رۆح ئەوكاتە هەست بەوە دەكات كە شێوەیەكی هەستی‌و تاكی دیاریكراو نییە بتوانێت بە شێوەیەكی ڕاستەقینەو تەواو دەربڕی سروشتیی ئەو بێت، چونكە تاك یەكێكە لەنێو كۆمەڵێكی تردا، ئەویش تاكێكی دیاریكراوو نا ئازادە، مادامەكی شێوەیەكی هەستی دیاریكراویش هەیە بۆ نمایشكردنی رۆح، ئەوە رۆح لەبەرجەستەبوونی هەستی خۆی دەدزێتەوەو دەگەڕێتەوە نێو خودی خۆی، ئەم ئاڵوگۆڕو بزاڤە گۆڕانكارییە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی جۆرێكی نوێی هونەر، جۆرێك كە رۆح تێیدا هەوڵدەدات هێدی هێدی لەنێو داڵانەكانی جیهانی تایبەت بەخۆی بسووڕێتەوە تا ماسكە هەستییەكان بەلاوە بنێت‌و بەرەو ناوەوەی خودی خۆی بكشێتەوەو خۆیشی لەبەرجەستەیوونی ئەبستراكتییانەی ماددییەوە دەرباز بكات، بەم شێوەیەش لایەنی بەرجەستەكراوی ماددی رۆح كۆنترۆڵی ماددە دەكات، ئەم شێوازەش لەلای هیگڵ بریتییە لەهونەری ڕۆمانتیكی، بەم جۆرە هیگڵ تایبەتمەندێتی بنەڕەتی هونەری ڕۆمانتیكی دەخاتە ڕوو، ناوەڕۆك لەنێو هونەری ڕەمزیدا لەدەرەوەی شێوەبوو، بۆیە ماددە كۆنترۆڵی رۆح دەكات، كەچی ناوەرۆك لەنێو هونەری كلاسیكیدا چووەتە نێو شێوەو لەناوەخۆی گرتووە، بۆیە بەتەواوی دەربڕی خۆیەتی‌و رۆح ئاوێتەی ماددە بووە، بەلام رۆح لەنێو هونەری ڕۆمانتیكیدا نەچووەتە نێو شێوەی ماددی، بەڵكو لەو شێوەیەشی تێپەڕكردووە، لێرەشدا رۆح باڵا دەست دەبێت‌و دەچێتە نێو بوون‌و لەدوای خۆیدا بەرجەستە بوونی ماددییانەی خۆی جێدەهێڵێت، بۆیە لێرەشدا ناوەرۆك‌و شێوە وەكو هونەری ڕەمزی بە دوو ڕێگای دژكارو جیادا تێپەڕ





دەبن، هەر یەکێکیان لە ئاست ئەویتردا نەناسو نادیارەو پشتیان کردۆتە ئەم یەکێتییە تەواوو گونجاوەی لەنێوانیاندا هەبوو.

هیگڵ لەپاش ئەم ڕاڤەکردنانە، بەپشت بەستن بەچەمکی دیالیکتیكو مۆدێرنیزم جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هونەری ڕەمزی بالاترین جۆری هونەر بوو، دواتریش هونەری کلاسیکی دێتو دەبێتە بالاترین جۆری هونەر، مادامەکی ماناو مەبەستی بنەڕەتی هونەر بریتییە لە یەکێتی تەواوی نێوان ناوەڕۆكو شێوە، ئەوە هونەری کلاسیکی، چونکە دەتوانێت ئەم ئامانجە بپێکێت تاکە هونەری تەواوە، بەلام لەملاشەوە هونەری ڕۆمانتیکی، چونکە رۆح تێیدا زۆر بەڕوونو ئاشکرایی درك بەسروشتی تایبەتی خۆی دەکات، بۆیە پێی وایە لەلایەنی پێشڤەچوونی رۆحییەوە هونەری ڕۆمانتیکی لەهونەری کلاسیکی بالاترو بەرزترە، لەگەڵ ئەوەشدا چونکە هونەری ڕۆمانتیکی لەجۆری هونەری تەواو تێپەڕ دەکات ئەوە دیارە لەسنووری گشتی هونەریش ڕەتدەدات، لەواقیعیشدا ئەوە قۆناغی گواستنەوەو پازدانە کە تێیدا رۆح لەنێو بازنەی هونەر دێتە دەرو بازدەداتە نێو بازنەی ئایین.

لەم حاڵەتەشدا رۆح هەست بەوەدەکات هیچ شێوە بەرجەستەبوونێکی هەستی تەواو نییە تا خۆی لەسایەیەوە دەربخات، چونکە ئەوەی لەمەزنێتیو پایەبەرزی رۆح بەرز دەکاتەوە لایەنی ناوەوەو رۆحییەتی کە هیچ شێوەیەکی ماددی ناتوانێت بیشێوێنێت، ژیانی ناوەخۆی دەروون یا خودێتی ڕەها بابەتی سەرەکیو جەوهەری هونەری ڕۆمانتیکییە، هونەری ڕۆمانتیکی لەسەرجەم ئامانجو ئاستو مەبەستەکانییەوە هونەری سەردەمو نوێی ئێستای ئەوروپایە، یا بەشێوەیەکی تر هونەری ڕاستەقینەی ئایینی مەسیحییە.



پاش ئەم لێکدانەوەیەی پرسی مۆدێرنیزم لەسایەی چەمکی دیالیکتیدا هیگڵ پێی وایە ئەگەر رۆح گەرەکی بێت ئیدراك بەسروشتی خودی خۆی بکات، واتا ئیدراك بەسروشتی ڕاستەقینەی خۆی بکات، ئەوە دەبێت ئەم





درك پێکردنە وەکو رۆحێکی عەینی بەدی بکات، بەلام رۆح پارچە پارچە دەبێتو لەناوەخۆیدا دووچاری ململانێ دێت، دواتریش دێتو لەگەڵ خودی خۆیدا ئاشت دەبێتەوەو ئەم پارچە پارچەبوونەی خۆی یەکدەخاتەوە، بەم شێوەیەش لەخانەی ململانێ دێتە دەرو بەرەو قۆناغی هێمنیو شادومانی هەنگاو دەنێت، ئەم قۆناغەی هێمنیو شادومانی رۆح قۆناغی بێدەنگیو بێکاریو گوم بوون نییە، بەڵکو ئەو هێمنییەیە کە لەدوای ململانێو بزاڤەوە دێت، فەرمانو کاری جەوهەری هونەری ڕۆمانتیکی بریتییە لەنمایشکردنی ئەم ڕووگەیەی رۆح، چونکە پێویستە لەسەری بەسەر ئەویتری خۆیدا زاڵ بێت، ئەویتر لەنێو هونەری کلاسیکیدا سروشتە، یا بەشێوەیەکی گشتی جیهانی هەستەکانە، ناوەرۆکی رۆحی لەوێدا پێویستی بەوە هەبوو نێوان خۆیو ئەویتر کە بریتییە لەنێوەندی هەستی چاك بکاتەوەو لەگەڵی بگاتە ڕێککەوتنێك، بەلام مادامەکی رۆح لەنێو هونەری ڕۆمانتیکیدا لەجیهانی هەستی بەرەو جیهانی تایبەتی خۆی کشایەوە دواوە، ئەوە ئەم دابەشبوونەی کە لەسەریەتی چاکی بکاتەوە، ئەوە ئێستا کەوتۆتە ناوەوەی خودی خۆی، چونکە ئەوەکەیتر لێرەدا جیهانی هەستی نییە، بەڵکو جیهانی رۆحییە، ململانێی ناوەخۆی رۆح لەگەڵ خودی خۆیداو نامۆبوونی لەئاست خودەوەو پێکهاتنو ڕێکەوتنی کۆتایی خودێتی بوو بەناوەڕۆکی هونەری ڕۆمانتیکی، لەبەر ئەم هۆکارانە دەبینین کاتێك هونەری کلاسیکی هەڵگری شێوەیەك لەجێگیربوونو هێمنیو حەسانەوەو کامەرانیو نەمرییە، ئەوە بەپێچەوانەوە هونەری ڕۆمانتیکی بەرەو وێناندنی ململانێو کارو بزاڤ دەچێت، لەنێو هونەری کلاسیکیدا ئێشو ئازارو تلانەوەو شەڕ یا ئەوەتا بەلاوە دەنرێن، یاخود وەکو شتێکی ناجۆرو ناشیرین نمایش دەکرێن، یا ئەوەتا فەرامۆش دەکرێنو دەخرێنە دواوە، کەچی ئەم بابەتانە دەچنە نێو نێوەندەکانی پێکهاتەی هونەری ڕۆمانتیکی، چونکە هونەرمەندی کلاسیکی ئەم شتانە وێنا ناکات، کەچی ئێشو ئازارو ئەشکەنجەو شەڕو ناشیرینی لەنێو هونەری ڕۆمانتیکیدا

جێگای خۆیان داگیردەکەن‌و بوونی خۆیان دەسەلمێنن، چونکە هونەری کلاسیکی دەربڕی ڕۆحێکی پچڕاوە، یا بەشێوەیەکی تر دەربڕی ڕۆحێکە لەگەڵ خودی خۆیدا لەململانێدایە، ئەوەش بابەتی هونەری ڕۆمانتیکییە.

بەم شێوەیەش مادامەکی ڕۆح لەنێو هونەری ڕۆمانتیکیدا بەرەو ناوەوەی خۆی کشاوەتەوە، بۆیە ئەوەی وەکو بەهایەکی ناکۆتا تێی دەڕواندرێت تەنیا خودی خۆیەتی، بەلاّم جیهانی ماددی بۆتە شتێکی لاوەکی‌و بێمانا، بۆیە دەبینین هیگڵ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە بەهای ناکۆتایی کەسایەتی سیمای دیارو بەرچاوی بنەڕەتی هونەری ڕۆمانتیکییە، ئەوەش زۆر بەڕوونی لەلایەنی ئەدەبییەوە خۆی دەردەخات، ئێمە بەردەوام دەبینین لەنێو ئەدەبی ڕۆمانتیکدا بایەخ بە ناوەرۆکی ڕۆحی دەدرێت‌و لایەنی بابەتی بەلاوە دەنرێت، بەلاّم وەکو دیارە کەسایەتییەکانی نێو ئەدەبی کۆن کەسایەتی خۆیان لەسایەی چەند بەهایەکی ڕەوشتییەوە دیار دەکەن، وەك خۆشەویستی خێزان‌و پاراستنی‌و قوربانیدان لەپێناو دەسەلاّت‌و دەوڵەتدا، کەچی دەبینین لەنێو ئەدەبی نوێدا کەسایەتییەکان بە پلەی سەرەکی دەربڕی خودی خۆیانن، واتا ئەو سەرچاوەیەی چالاکی لێ وەردەگرن بنەماو بەهای ڕەوشتی چەمکە کۆنەکان نییە، بەڵکو پەیوەستە بەتایبەتمەندێتیی تاك‌و کەسایەتی خودی، بۆیە ئەم کەسایەتییانە مەبەستیان بەدیهێنانی ئامانجی گشتی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو بەدوای مەبەستی تایبەتی خۆیاندا وێڵن.

هیگڵ دوای ئەوەی سروشتی ئەم گۆڕانکارییانە لەلایەنی هونەری‌و ئەدەبییەوە ڕاڤە دەکات، دەگاتە ئەو بڕوایەی هونەری ڕۆمانتیکیش تۆوی هەڵوەشاندنەوەو دارمانی لەنێو جەستەی خۆیدا هەڵگرتووە، چونکە هونەر بەپێی بیرۆکەی تۆتالیتارییانەی ئەو بریتییە لەیەکبوونی ناوەڕۆکی ڕۆحی ڕەها لەگەڵ شێوەی بەرجەستەکراوی دەرەکیدا، بۆیە دەگاتە ئەو بڕوایەی هونەری ڕۆمانتیکی لەچرکەیەك لەچرکە مێژووییەکاندا لەخانەی هونەر دەرچووە، ئەویش ئەوکاتە بوو کە هاوشانی‌و تەبایی نێوان هەردوو لایەنی







هونەری کلاسیکی تێکشکاند، کەواتە مادام ڕۆح ناتوانێت لەلایەنی هەستییەوە بەتەواوی خۆی بەرجەستە بکات‌و دەرببڕێت، ئەوە پێشڤەچوونی لۆژیکییانەی ئەم پرەنسیپە بەرەو ئەوەیان دەبات بەیەکجار لەیەکتر بترازێن‌و جیاببنەوە، هەر کاتێکیش ئەوە ڕوودەدات هونەر بەتەواوەتی هەڵدەوەشێتەوە، ئەوکاتەش بەپێی بۆچوونەکانی هیگڵ ڕۆح دەگاتە ئەو بڕوایەی هونەر نێوەندی ڕاستەقینەو تەواوی ئەو نییە، ئەو ساتەش ڕۆح پێویستی بەنێوەندو سەنتەرێکی تری نوێ هەیە تاوەکو خۆی تێدا بەدی بکات، ئەم نێوەندو سەنتەرە نوێیەش بریتییە لەئایین(٢٩).

## دیالیکتیك..... پرۆسەیەك بۆ مۆدێرنیزم

هیگڵ کاتێك باس لەدیالیکتیك‌و کردەی دیالیکتیکی دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ڕووگەیەکی پێشکەوتنخوازەو پشت بەشارەزایی‌و ئەزموون دەبەستێت، ئەوکاتەی هۆشیاری لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر هەنگاو دەنێت لەسایەی ئەم پرسە دیالیکتیکییەدا، هەریەك لەمەعریفەو بابەتی مەعریفە دووچاری جۆرە گۆڕانکارییەك دێن. خودی دیالیکتیك وەك زاراوەو مانا بریتییە لەزانستی گشتی پێشڤەچوون‌و گۆڕان کەوا ئاراستەی پێشڤەچوونی سروشت‌و کۆمەڵگاو هزر دەکات، چەمکی دیالیکتیك بەمانای سەیروورەت‌و گۆڕانی بەردەوام دێت بەشێوەیەك هەموو بابەتێك دەشێت بگۆڕێتەوە سەرباری‌ێکی تری دژکارو ناتەبای بابەتی بنەڕەتی خۆی، لەنێو فەلسەفە بەگشتی هیگڵ یەکەم فەلسەفەکارو هزرڤان بوو سەرجەم جیهانی سروشتی‌و مێژووی عەقڵ دەخاتە نێو پرۆسەیەکی دیالیکتیکیانەی گۆڕان‌و پێشڤەچوونی سەیرورەتی بەردەوام‌و هەوڵی ئەوەی داوە ئەم یاسا بنەڕەتییانە بدۆزێتەوە کە ئەم ڕووگەیە بە ڕێوەدەبەن، بۆیە ئەو بڕوای بەوە هەبووە کە عەقڵ بریتییە لەگۆڕان لەپێناسەو ناسنامەیەکەوە بۆ

پێناسەو ناسنامەیەکی تر، لەهەمان کاتیشدا یەکلایەنو ئاستی دیاریکراوی ئەم گۆڕانانە دیاری دەکات، بۆیە هیگڵ دەڵێت:( دیالیکتیك بریتییە لەژیانو دەروونی پێشکەوتنی زانستی، ئەو دینامیکییەتەیە کە بەتەنیا پەیوەستکارێكو پێداویستییەکمان پێدەدات کەلەنێو خودی جەستەی زانستدان)(٣٠). ئەو تێڕوانینەی هیگڵ بۆ دیالیکتیك ئەوە پیشان دەدات کەدیالیکتیك لەناوە خۆیداو لەلایەنی ژیاریو هزریدا توخمی شۆڕش لەخۆیەوە دەگرێت، بۆیە هرز دەگاتە ئەو بڕوایەی دیالیکتیکی هیگڵ بە زانستی شۆڕشی تۆبزیکاری ناوزەد بکات.

ئەم بزاڤە دیالیکتیکەی کە وشیاری لەنێوخودی خۆیدا دووچاری دەبێت، بەتەنیا لەخودی مەعریفەوە نییە، بەڵکو لەبابەتی مەعریفەکەشدایە، چونکە وشیاری خۆی لەئاست بابەتێکی نوێ دەدۆزێتەوە کە لەبەردەمیدا سەرهەڵدەدات، بۆیە ئەم بابەتە نوێیەی کە بۆ جیهانی بوون دێتە سەرهەڵدانو وانمایش دەکرێت کەخودی وشیارییە گۆڕانی بەسەرداهاتووەو هاتۆتە بوون. وشیاری لەلای هیگڵ بریتییە لەو پێوەندییە بەردەوامە بەئەوی ترەوە، ئەوی تریش بریتییە لەبابەت یا جیهان یا سروشت، لەگەڵ ئەوەشدا خودی جیهان ئەو ئاوێنە مەزنەیە کە وشیاری خۆی تێدا بەرجەستە دەکاتو دەناسێتەوە، کەواتە مێژووی وشیاری بۆ خۆی مێژووی ئەم بابەتانەیە کە درکیان پێدەکات، یا مێژووی ئەو ڕاستییانەیە کە لەکاتی درککردنی جیهاندا دەیاندۆزێتەوە، کەواتە لێرەدا ئێمە کاتێك مێژووی جیهان دەخوێنینەوە یا مێژووی ئەو بابەتانە دەخوێنینەوە کە خود درکیان پێدەکات، ئەوە لەهەمان کاتیشدا مێژووی خود دەخوێنینەوە، بۆیە کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح) بەتەنیا نمایشکردنێکی فەلسەفی نییە بۆ مێژووی جیهان، بەڵکو لەبنەڕەتدا مێژووی ویژدانە لە حاڵەتی بالأبوونی خۆیدا، لەحاڵەتی ئیدراکی ئەزموونییەوە بۆ ئاستی مەعریفەی ڕەها.

هیگڵ دەڵێت:( کاری فەلسەفە تەنیا ئەوەیە درك بەوشتە بکات کە بوونی هەیە، لەبە ئەوەی ئەو شتەی بوونی هەیە خودی عەقڵە، ئەگەر لەڕوانگەی





تێڕوانینی تاکەوە بڕوانینە مەسەلەکە، ئەوە دەبینین هەر کەسێك کوڕی سەردەمەکەی خۆیەتی، ئەوەش حاڵی فەلسەفەیە، چڕکراوەی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا سەری هەڵداوە، بەڵام لەلایەنی هزرییەوە، وەکو چۆن گەمژەییە مەزندەی ئەوە بکەین کە تاك توانای ئەوەی هەبێت بەرەو دواوەی سەردەمەکەی خۆی باز بدات، ئەوە گەمژەییە گەر مەزندەی ئەوەش بکەین هەر فەلسەفەیەك توانای ئەوەی هەبێت لەم سەردەمەی خۆی تێپەڕ بکاتو بازبدات)(٣١). بەم شێوەیەش بێت دیارە فینۆمینۆلۆژیا وەسفکردنی بالأبوونی کولتووری تاکە لە ئاستی منی موتەناهی بەرەو ئاستی منی ڕەها، چونکە کولتوور لە ڕوانگەی هیگڵ ـەوە کرداری بالأبوونی خودی تاکە بەرەو ئاستێك کە دەبێتە منی تۆتالیتاریو لەناوەخۆیدا سەرجەم بەهاکانی ڕۆحی سەردەم کۆدەکاتەوەو دەگرێتە خۆی، لێرەدا عەقڵی فەلسەفی ئەم گۆڕانانە بە شێوەیەکی تر بەدی دەکات، بۆیە زۆرجار ئەم گۆڕانانەی کەپێی وایە گۆڕانێکی بابەتییە لەڕاستیدا وادەردەکەون کەگۆڕانێکی خودییە، چونکە عەقڵی فەلسەفی ئەوە دەزانێت کە جیهانی دەرەکی واقیعێکی سەربەخۆو جیاواز نییە بۆخۆی، بەڵکو جیهانی دەرەکی واقیعێکە ئەنجامی کرداری ڕۆحە، بۆیە ئەوەی ڕوودەدات ئەنجامی چالاکی ڕاستەوخۆی ڕۆحە، لەواقیعدا بیرۆکەی بوونی شتێك بۆخۆی لەنێو خۆیدا دژکاری هەڵدەگرێت، چونکە ئەوکاتەی ئێمە هەوڵدەدەین مەزندەی هەر شتێك بکەین گوایە جیاوازو دابڕاوە یا ئەبستراکت کراوە، واتا دەکەوێتە دەرەوەی سەرجەم پێوەندییە ژیارییەکان، ئەوە ئێمە دووچاری دژکاری دێین، ڕاستە ئەو شتە بۆخۆی بوونی هەبووە، بەڵام وەك ئەوەی هیگڵ دەیبینێت لەهەمان کاتیشدا بۆ ئەوانی تریش بوونی هەیە، چونکە لەنێو خودی خۆیدا لەسەر دوو ئاستەوە بوونی هەیە، یا ڕاستتر وایە بڵێن دو جۆرە بوون هەیە، جگە لەوەی بوونی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بۆ ئەوانی تریش بونی هەیەو بگرە لەسایەی ئەو پێوەندییانەیەوە بوونی هەیە.

پرسی دیالیکتیکی پرسێکە بەردەوام برەو بە هێزی ململانێ دەدات. ئەم ململانێیەش لەنێوان دوو هێزی دژکاری یەکتردایە، هێزی فەلسەفیو نۆستالیژخوازو هێزی نوێکارو ئایندەخواز، ململانێی نێوان ئەم دوو هێزە لەنێو گەردوونو کۆمەڵگاو واقیعی کۆمەڵایەتیدا هێزی پاڵنەری ئەنجامدانی گۆڕانەکانە لەسەر سەرجەم ئاستو لایەنەکانەوە، ئەم گۆڕانەیە هیگڵ بە دیالیکتیك ناوزەدی دەکات. ڕاستە ئەو باسی دیالیکتیکی رۆح یا عەقڵ دەکات بۆ سەلماندنی بوونی خودی خۆی لەنێو گەردووندا، بەڵام ئەم پرسە تۆتالیتاریو گشتگیرو هەمە لایەنەیەو سەرجەم ئاستە جیاجیاکان دەگرێتەوە، ئێمە لەگەڵ هیگڵ-دا ئەوەمان زانی کەهەر سەردەمێك خاوەنی تایبەتمەندی ژیاری تایبەت بە خۆیەتی، بۆیە لەنێو ئەم پرۆسە دیالیکتیکیەشدا لەوە دەگەین کەهەر گۆڕانو داهێنانێکی نوێ پەیوەستە بە بارودۆخێکی مێژوویی لەبار بۆ ئەنجامدانی ئەم داهێنانە نوێیانە، هێزی نوێکار بەردەوام لەبەرەوپێشڤەچووندایە، بەڵام هێزی کۆنخوازو سەلەفیو نۆستالیژ ڕێگرو بەربەستن لەبەردەم ئەنجامدانی ئەم گۆڕانە ڕیشەییانە، خودی ئەم دوو ڕەوتە نوێو کۆنە لەناوەوەی خۆیاندا لە ململانێدان بۆ بەلاوەنانی کاریگەری یەکتری، چونکە نوێ بەردەوام لەنێو منداڵدانی کۆندا دێتە بوون، ئەم لەدایکبوونەی نوێ لەسەلەفێکی کۆن دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم نوێیە هەموو ئەو لایەنە پۆزەتیڤانە لە خۆیەوە بگرێت کەوا کۆن هەڵگریەتی، سەرهەڵدانی نوێ بەردەوام لەشێوەی بازدان دەبێت، چونکە نوێ ئەنجامی سەرجەم گۆڕانە دژکارەکانە، لەهەمان کاتیشدا قۆناغێکی نوێیە بۆ ململانێ لەگەڵ نوێی داهاتوودا، هیگڵ زۆر چاك ئەوە دەزانێت کە داهێنراوی نوێ لەسەرەتادا بێ هێزو لاوازە لە ئاست ئەو هێزەی کۆن هەیەتی، بەڵام لەبەرئەوەی مێژوو ڕێگای لێ ناگیرێتو گۆڕانە دیالیکتیکیەکانیش ناوەستێنرێنو سەرکوت ناکرێن، بۆیە پرۆسەی بەلاوەنانی نوێ لەلایەن کۆنەوە سەرکەوتوو نابێت، لەئەنجامیشدا کۆن بەیەکجاری بەلاوە دەنرێت.





هیگڵ کاتێك ئەم پرسە دیالیکتیکییە ڕاڤە دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات نوێ هەڵگری دژکاری نوێیە لەناوەوەی خۆیدا کە ڕێگا خۆشکەرە لەبەردەم سەر لەنوێ بەلاوەنانی، چونکە لەقۆناغێکی دواتردا نوێش وەکو کۆن خۆی نمایش دەکاتو دەبێتەوە بەربەستو ڕێگر لەبەردەم پێشڤەچووندا، نوێ بەردەوام لەململانێیدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، چونکە پەیوەستی پرۆسەی پێشڤەچوونی دیالیکتیکییەو ناوەستێتو لەگەڵ پرۆسەی پێشڤەچوونی مێژوودا هاوشانو هاوتەبایە. هەر بابەتێکی نوێ کاتێك دووچاری تەموومژێکی توندو بەردەوامی نوێی هزری دەبێتەوە توانای بەربەرەکانێو بەرەنگاربوونەوە لەدەست دەدات، لەهەمان کاتیشدا ناتوانێت لەناوەخۆیدا بگرێت، ئەوکاتەش دووچاری یەکێك لەم دوو حاڵەتەی خوارەوە دەبێتەوە، یا ئەوەتا هەڵدەوەشێتەوەو گونجانی ناوەکی خۆی لەدەست دەدات، یا ئەوەتا میکانیزمی کارکردنو تێڕوانینی خۆی لەدەست دەداتو ناچارە خۆی لەگەڵ میکانیزمی تێڕوانینی نوێدا بگونجێنێتو دەست بەرداری بۆچوونەکانی پێشووتری خۆی بێت، ئەم کردەیەش کردەیەکی بنچینەییە بۆ گۆڕانی واقیعو ئاراستەکردنی بەشێوەیەك لەگەڵ بارودۆخی نوێدا بگونجێت، ئەوەش یەکێکە لەسەرچاوەکانی نوێگەریو نوێکاری.

ئێمە ئەوە بەدی دەکەین کە هیگڵ هەوڵیدا لە سایەی بانگەشەی مۆدێرنیزم بۆ سەردەمو زەمەنە تازەکاندا مۆدێرنیزم وەك پرۆسێسێکی نوێ بۆ سەرچاوەو بنچینەی کولتوورێکی نوێی فەلسەفیو عەقڵی بخاتە ڕوو، بەشێوەیەك عەقڵ لەنێو هەر سێ ڕەهەندەکانییەوە سەرلەنوێ بونیاد بنێتەوە، ئەم سێ ڕەهەندەی نوێگەریو مۆدێرنیزمی هیگڵ-ی بریتییە لەسێ سیستماتیکی میکانیزمی عەقڵی بەدرێژایی سەردەمە مێژووییەکان، سیستماتیکی عەقڵی تیۆری، ئەو سیستماتیکەی لەنێو کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا بنچینەو بنەچەی مەعریفەی تیۆری عەقڵی داڕێژراو دادەهێنێتو دەرگا لەبەردەم دامەزراندنی زانستی نوێ والآ دەکات.





سیستماتیکی عەقڵی پراکتیکی ئەوەش ئەو سیستماتیکەیە کە پێوەری ڕەفتارو ئەدگاری ڕاست سەبارەت بەپراکتیك کردنی هزرو عەقڵ دیاری دەکاتو هێڵی ئەم کارکردنە لەسەر نەخشەی هزردا دەکێشێت، سیستماتیکی عەقڵی خەیاڵی یا ڕەمزی ئەوەش لەپێناو دیاریکردنی پێوەرەکانی جوانیو ئیستاتیکای هونەرو ئەدەبو کولتوورەوە. ئەم داڕشتنەوەیەی هیگڵ بۆ سێ ڕەهەندی کارکردنی عەقڵ ئەوە دەردەخات کە مۆدێرنیزم لەلای ئەو پرۆسەیەکی تۆتالیتاریو هەمەکییەو سەرجەم لایەنە ژیارییەکان دەگرێتەوە.

کاتێك هیگڵ چەمکی ڕەهایی بەکاردێنێت تا وەسفی عەقڵی پێبکات، ئەوە زیاتر مەبەستییەتی کاریگەرییەکی فەلسەفییانەی پێبدات، لەسایەی ئەم مەزندەیەشەوە فەلسەفە لە توانایدایە ئامانجگەرایی خۆی کەلەسەر بەڵگەی بوونی هێزی عەقڵ بونیادنراوە بسەلمێنێت، بەکردارەکییانەش عەقڵ لەنێو پرۆسێسی فەلسەفیدا پێویستە خۆی وەکو هێزی ئاراستەکاری ئەم لێکدابڕانە هزرییانەو دواتریش یەکخستنیانو ڕێکخستنیان لەنێو چوارچێوەی خودی عەقڵدا نمایش بکات. بۆیە کاتێك ڕەخنە ئاراستەی دژکارە فەلسەفییەکانی نێوان سروشتو ڕۆحو تێگەیشتنو خەیاڵو موتەناهیو ناموتەناهیو مەعریفەو بڕوا دەکات، ئەوە گەرەکیەتی وەڵامی قەیرانێکی تر بداتەوە، ئەویش دابەشبوونو هەڵوەشاندنەوەی خودی ژیانە لەسایەی ئەم هەموو دژکارییەی سەدەی هەژدەیەم بەرهەمی هێنا بە شێوەیەك بووەهۆی لەیەکتر دابڕاندنی ئایینو ڕەوشتو عەقڵو سەرهەڵدانی پرۆسەیەکی مەدەنییانەی مۆدێرنیزم کە عەقڵ ئاراستەی دەکات، دوور لە میتافیزیکاو یۆتۆپیای کۆمەڵایەتی، ئەم نوێگەرییە لەسەر پاشماوەی نەخشەی زەینی کۆنی بەرلەسەردەمی چاکسازی ئایینی بونیادنەنراوە، بەڵکو نەخشەی زەینی لەسایەی پرۆسەی بەعەقڵانییەت بوونەوە گۆڕانی تەواوی بەسەر داهاتو بەشێوەیەکی نوێ داڕێژراوە تالەگەڵ ئەو ئازادییە بگونجێت کەمرۆڤ شۆڕشی لە پێناودا ئەنجام دابوو.





کولتووری هزری سەردەمی ڕۆشنگەری لەسایەی کردەیەکی نەشتەرگەرییانەدا لە ئایین جیاکرایەوەو دابڕا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئایینی فەرامۆش نەکرد، ئەوەتا هیگڵ لەنێو کتێبی (فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح)دا دەڵێت:( هەرچەند کولتوور گەشە بکات، ئەنجامەکانی ژیان هەمە جۆرتر دەبن، بەشێوەیەك دەکرێت ئەم جیاوازیو دابڕانە ئاوێتەی یەکتری ببنو زیاتر کۆششی ژیان بۆ لە دایکبوونەوەی ڕێکخستنەوەی خودی خۆی نامۆتر دەبێت لە هەمەکێتی کولتوورو لەو دەلالەتە ئەپستراکت دەکرێت، ئەوەش کۆششێك بوو پێشووتر ئایین ئەنجامی دەدا(٣٢). ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەرئەوەی هیگڵ لەو تێکئالاوییەی ژیانو سەرجەم بوارە تایبەتییەکان دەگات لەگەڵ ئاییندا، بۆیە ئەو کاتێك ڕەخنە لەو تێڕوانینە تێرامانکارییەی ئایدیالیزمی خودی دەگرێت، ئەوە لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەخنە لە پرۆسەی مۆدێرنیزم دەگرێت کە ناتوانێت خۆی لەم تێڕوانینە کلاسیکییە باوە دەرباز بکات. گوتەی زەمەنە نوێیەکان هەوڵدانە بۆ هێنانەکایەی مەعریفەیەکی فەلسەفیو تێڕوانینێکی فەلسەفی نوێ کە خۆی لە ئایدیالیزمی دیالیکتیکیدا دەبینێتەوە، بۆیە مۆدێرنیزم لەلای ئەو پێویستە بۆ خۆی لەسایەی شێوازە تایبەتییەکانی خۆیەوە خۆی دابمەزرێنێت، واتا نوێگەری دەبێت هەموو ئامرازەکانی کەخودی خۆی پێ دادەمەزرێنێت لەگەڵ خۆیدا دابهێنێت.

دیارە هیگڵ یەکەم بیریارو فەلسەفەکار نەبووە ئاماژە بە مۆدێرنیزمو گۆڕانە ڕیشەییەکان دەکات، کەدەکرێت مۆدێرنیزم لەگەڵ خۆیدا دابهێنێت، بەڵام یەکەم هزرڤانو فەیلەسووفە مۆدێرنیزم بەم چەمکە فەلسەفییە قووڵە دەخاتە ژێر ڕۆشناییو دەیکاتە بابەتێکی پڕ بەها، بەم شێوەیە مۆدێرنیزم بە ڕەهەندەکانی وشیاری سەردەمو عەقڵانییەتەوە پەیوەست دەکات، تا عەقڵانییەت بتوانێت دەرگا لەبەردەم نوێگەریدا والا بکات، بۆ ئەوەی بۆخۆی وشیاری خۆی دابمەزرێنێت بەپێی ئەو پێوەرو بەهایانەی خۆی هەڵگریەتیو مەبەستییەتی بەگشتیان بکات.





## پەراوێزو سەرچاوەکانی بەشی سێیەم

١) الموسوعة الفلسفية، م. روزنتال-يى.يودين، ترجمة- سمير كرم، بيروت، ١٩٨٠، ص١٠٣.

٢) الموسوعة الفلسفية المختصرة، ترجمة- فؤاد كامل، جلال العشرى، عبدالرشيد الصادق، بغداد، ١٩٨٣، ص٥١٦.

٣) بارمنديسرفەلسەفەکارێکی گریکی کۆنەو مێژووی لەدایکبوونو مردنی نادیارە، بەلاّم وەلئاشکرایە لە ماوەی نێوان سەدەی شەشەمو پێنجەمی بەر لە زایین ژیاوەو ڕابەری قوتابخانەی ئیلییەکان بووە.

٤) هیراکلیتسفەلسەفەکارێکی گریکی کۆن بووە (٥٤٤-٤٨٣) ی پێش زایین ژیاوە.

٥) فلسفة هيجل، ولتر ستيس، ترجمة- امام عبدالفتاح امام، القاهرة، ١٩٨٠، ص١٩١.

٦) ئیمانوێل کانت (١٧٢٤-١٨٠٤) فەیلەسوفو زانایەکی ئەڵمانی بووەو بەدامەزرێنەری ئایدیالیزمی کلاسیکی ئەڵمانی دادەنرێت.

٧) فردریك فلهیلم جۆزیف فۆن شیلنگ(١٧٧٥-١٨٥٤) فەیلەسوفێکی ئەڵمانی بووەو ئەندامی ئەکادیمیای زانستی بووە لە شاری میونیخ.

٨) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجز الأول، القاهرة، ص١٣٣.

٩) القول الفلسفي للحداثة، هابرماس، ترجمة- د. فاطمة الجيوشي، سوريا، ١٩٩٥، ص١٤.

١٠) مختارات هيجل، ترجمة- الياس مرقص، الجز الأول، بيروت، ١٩٧٨، ص٧.

١١) مختارات هيجل، ترجمة- الياس مرقص، الجز الأول، بيروت، ١٩٧٨، ص٧.

١٢) القول الفلسفي للحداثة، هابرماس، ترجمة- د.فاطمة الجيوشى، سوريا، ١٩٩٥، ص٣٠.

١٣) القول الفلسفي للحداثة، هابرماس، ترجمة- د.فاطمة الجيوشى، سوريا، ١٩٩٥، ص٣٠.

١٤) بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە(تارمایی جەستە) ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٣٩.

١٥) تطور الفكر الفلسفي، تيودور اويزرمان، ترجمة- سمير كرم، بيروت، ١٩٧٩، ص٢٣٢.

١٦) بڕوانە (فەلسەفەی دەوڵەت) ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، هەولێر، ١٩٩٧.

١٧) ئەپستمۆلۆژیاو فەلسەفە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، کتێبێکی دەستنووسە.

١٨) تاريخ الفلسفة، اميل برهيية، ترجمة- جورج طرابيشي، القرن التاسع عشر، ص١٩٩.

١٩) سکۆلستیکییەتواتا جێگیربوونو چەقبەستنی عەقڵ لەنێو کۆمەڵێك پرسو بابەتو مەسەلەکە لەسەردەمو شوێنێکی دیاریکراودا داڕێژراون.





٢٠) لەگەڵ ئەوەی زۆر لە بیریارو هزرڤانان گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەخودی فەلسەفەکەی هیگڵ یش لەمڕەخنەیە بەدەر نییە،لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی هیگڵ لەبیریارانی تری بەرلەخۆی جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەو بەکردەیەکی لۆژیکیو لەسایەی پرۆسەیەکی دیالیکتیکیانەی داڕێژراوی توندو تۆڵدا، بوونی عەقڵی ڕەهای گەردوون دەسەلمێنێت.

٢١) تطور الفكر الفلسفي، تيودور اويزرمان، ترجمة- سمير كرم، بيروت، ١٩٧٩، ص٢٣٢.

٢٢) الموسوعة الفلسفية، م.روزنتال-يى.يودين، ترجمة- سمير كرم، بيروت، ١٩٨٠، ص٥٦٧.

٢٣) فلسفة الروح، ولتر ستيس، ترجمة، امام عبدالفتاح امام، بيروت، ١٩٨٢، ص١٤٠.

٢٤) ئەوەشرکێشەیەکی مەزن بوو، بەتایبەتیش دووچاری ئەنترۆپۆلۆژستەکان بووە، چونکە کاتێکئەوان لە هونەری ڕەمزیی کۆنیان کۆڵییەوە، ئەوە جگە لەم هونەرە شێوازێکی تریهونەریان دۆزییەوە ئەویش لۆگۆگرافیك بوو،واتا نووسینی وێنەیی، لەکاتی لێکدانەوەوڕاڤەکردنی ڕەمزەکان بینیان هەر وێنەو ڕەمزێك دەکرێت بەچەندین شێوازی ڕێزمانی بنووسرێتەوە.

٢٥) وشەیزەند کورتکراوەی وشەی زەند ئاڤێستایە، زەند واتا ڕاڤەکردن، ئاڤێستاش واتا یاسالێرەدا کاتێك هیگڵ وشەی زەند بەکاردێنێت ئەوە پێی وایە ئەم وشەیە مانای گەلی فارسی کۆن دەگەیەنێتو مەبەستی گەلانی ئێرانە.

٢٦) ئەمبۆچوونەی هیگڵ زۆر ڕاستو دروست نییەو تێڕوانینێکی ڕەگەزپەرستانەو ئایینی مەسیحییانەیەوسەپاندنی بالاّ دەستی کولتووری خۆرئاوای مەسیحییە لەبەرانبەر خۆرهەلاّتدا.

٢٧) فلسفة الروح، ولتر ستيس، ترجمة، امام عبدالفتاح امام، بيروت، ١٩٨٢، ص١٤٣.

٢٨)فلسفة الروح، ولتر ستيس، ترجمة، امام عبدالفتاح امام، بيروت، ١٩٨٢، ص١٤٣.

٢٩) لێرەدبەواری ئەوەمان نییە خۆمان بخەینە نێو کێشە ئایینییەکانی هزرو فەلسەفەی هیگڵ،بۆیە ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ کاتێکی ترو دەرفەتێکی تر جێدەهێڵین تا بتوانینبەپێی میکانیزمی ئایدیالیزمی دیالیکتیکی ئایینیش وەك نێوەندێکی کاری کۆمەلاّیەتیو هزری ڕاڤە بکەین.

٣٠) الموسوعة الفلسفية، م.روزنتال، يى.يودين، ترجمة- سمير كرم، بيروت، ١٩٨٠، ص١٦١.

٣١) هيجل، د. زكريا ابراهيم، الجزء الأول، القاهرة، ص١٨١.

٣٢) القول الفلسفي للحداثة، هابرماس، ترجمة- د. فاطمة الجيوشي، سوريا، ١٩٩٥، ص٣٦.

# لەکتێبە بڵاوکراوەکانی نووسەر

١ ) فەلسەفەی دەوڵەت، لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفی سیاسی مێژووییە، هەولێر، ١٩٩٧.

٢ ) قوتا بخانەی فرانکفۆرت، نووسینی: فیل سلیتەر، وەرگێڕانی بەهاوکاری ئیسماعیل کوردەو نوری بێخاڵی، هەولێر، سەنتەری نما، ٢٠٠٣.

٣ ) سیستەمی سیاسی، هزرو فەلسەفەی سیاسی، وەزارەتی ڕۆشنبیری- سلێمانی، ٢٠٠٣.

٤ ) هیگڵ، فەلسەفەو مۆدێرنیزم، چاپ یەکەم، دەزگای چاپو پەخشی ڕێبین، ٢٠٠٣.

٥ ) هەڵوەشاندنەوەگەرایی، نووسینی: پییر ڤی زیما، وەگێڕان لەعەرەبییەوە، دەزگای چاپو پەخشی ڕێبین، ٢٠٠٤.

٦ ) ئەپستمۆلۆژیاو فەلسەفە، نووسینی: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، دەزگای چاپو پەخشی ڕێبین، ٢٠٠٤.

٧ ) ئەنترۆپۆلۆژیا، نووسینی: ڕێبین ڕەسوڵ و دیار عەزیز شەریف، دەزگای چاپو پەخشی ڕێبین، ٢٠٠٤.

٨ ) بیرمەندان لەهەزارەی سێیەم ڕادەمێنن، وەگێڕان لەعەرەبییەوە، سەنتەری نما، ٢٠٠٤.







## چاپکراوەکانی سەنتەری نما ٢٠٠٤

١-ڕاپسکانێ لە دنیای سیاسەتو گەڕانەوەیەك بۆ دنیای شیعر

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی.. ماجید نووری

٢-جەژنی مەرگ، شیعر ، کەژاڵ ئیبراهیم خدر

٣-گلگامێش: و: ئیدریس شێخ شەرەفی

٤- شوێنکاتی یەکەم، لەدووەمو ئێستای سەگوەڕ،

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، عەبدولوتەڵیب عەبدوڵلا.

٥- دەرونزانی، وتار لێکۆڵینەوە شیکردنەوە

یوسف عوسمان حەمەد

٦-عەلمانییەتی ئەوانو نیگەرانی ئێمە

ئیسماعیل کوردە

٧- بیرمەندان لەهەزارەی سێیەم رادەمێنن

ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

٨-عەلمانیەتو کاریگەرییەکانی

جەمال پیرە

٩- دەسەڵاتو حەقیقەت ، ئیدریس شێخ شەرەفی

١٠- لەهۆرکهایمەرەوە تا هابرماس، قوتابخانەی فرانکفۆرت

ئیسماعیل کوردە، جەمال پیرە

١١-خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، ئاسۆ جەلال